دوکتۆر عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ




# فۆلکلۆری کوردی

## لێکۆڵینەوە

بەغدا / ۱۹۷۰

بەیاریدەی وەزارەتی کاروباری شیمال لە چاپ دراوە

دوکتۆر
عیززەدین مستەفا رەسوڵ

# ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی

## لێکۆڵینەوە

لە چاپخانەی ( دار الجاحظ ) لە چاپ دراوە
بەغدا ــ ١٩٧٠

# دراسة عن ادب الفولكلور ألكردي
## بقلم
## الدكتور عز الدين مصطفى رسول

---

**A Study in Kurdish Folkore**
**By**
**Dr. Izzadin Mustafa Racyl**

---

## فەرهەنگی هەندێ ووشەی لاتینی

ڕۆل : دەور
ئیستاتیك : جوانی‌ناسی ، علم الجمال
فۆرم : شێوە ، روخسار ، شكل
ژانر : بابەتی ئەدەبی ، النوع الادبی
ستیل : شێوەی تایبەتی‌ی هونەرمەند لە نووسینا ، اسلوب الادیب
تێكست : متن ، نص ، تیكستە لۆژی : تێكست ناسی
بیلۆگرافیا : تەرجومەی حاڵ
دیالێكت : شێوە ، زاراڤە ، لهجة
ئیپۆسیا : داستان
لیریك : هەست‌بزوێن ، غنائی ، عاطفی
تراگیدیا : كارەسات ، مأساة
ئۆبرەز : ئەدگار ، وێنە ، صورة ، نموذج
پۆڤێست : چیرۆكی ڕاستەقینە
ئۆبجەكتیڤی : مەوزوعی
ڕۆمان : چیرۆكی درێژ ، روایة
ڤاكت : شتی‌ڕووداو ، یا ڕاستەقینە ، وقائع
نێگێتیڤ : سلبی ، منفي
ئەرگیناڵ : ئەسڵ

بێ گومان ناتوانین بڵێین تا ئێستا زۆر لێ کۆڵینەوەمان دەربارەی ئەدەب و زمانی کوردی هەیە • بەڵکو بە پێچەوانەوە ، ئەتوانین بڵێین ـ لەم بارەیەوە تا ئێستا زۆر کەم نووسراوە ، گەر بێینە سەرباری راستی ـ ئەوا تا ئێستا لەم بارەیەوەو لە هەر مەیدانەشدا لە چەند کتێبێك و چەند ووتارێك زیاترمان نی یەو ئەوانیش زۆر کەم و کووڕیان تێدایەو هێشتا تەواو نەچوونەتە سەر بناغەی لێ کۆڵینەوەی زانستی تازە • نەتەوەی کورد خاوەنی گەنجینەیەکی نەتەوایەتیی بە نرخ و فراوانی فۆلکلۆر و ئەدەبی میللی و ئەدەبی کلاسیکی یەو ئەدەبیاتی هاودەمیش بە ڕێگەی بەرەوپێش چووندا هەر رۆیشتوە • زمانی کوردیش یەکێکە لە زمانە کۆنەکانی هیندۆ ئەورووپی • بەڵام لێ کۆڵینەوەی زانستیی ئەم ئەدەب و زمانە لە رادەی ئەدەب و زمانەکە خۆیدا نی یە •

بەشی زۆری ئەو شتانەی نووسراون هەوڵی جوامێرانەی تاقەکەسێن ، زۆرتریش تاقەکەسی ئەوتۆ کە هەلی وایان بۆ هەڵنەکەوتووە کە لە لێ کۆڵینەوەی ئەدەب و زماندا ، لەسەر شێوەی زانستی تازە شارەزای پەیڕەوی گەلانی تر بن ، بە تایبەتی گەلانی رۆژئاوا •

ئەم هەوڵە تاقەکەسی یانە ، بە کەرەسەی خاوی ، نرخ و بایەخی خۆیان هەیەو مایەی سەربەرزیی و سەرفرازیی خاوەنەکانیانن • بەڵام وا وورده وورده خوێندەواری کوردیش تواناو هەلی ئەوەیان بۆ هەڵکەوتووە کە ئەم لێ کۆڵینەوانە لەو سنووره بێننەدەرێ و ئاسۆیەکی زانستیی تازەی فراوانی بۆ دروست بکەن •

ئەم کتێبەو ئەوانی لەمەودوای ئەم زنجیرەیە هەوڵدانێکی سەرەتایی و دیسان تاقەکەسێن ، بۆ لەو سنوور چوونە دەرەوەیەو بۆ ئەو بەرەو ئاسۆ چوونە •

ئەم لێکۆڵینەوەیە لـــە جیهانی ئەدەبیاتناسیدا ئـــەچێتە ریزی مێژووی ئەدەبەوە ، هەرچەندە لە هەندێ شوێندا هەوڵی ئـەوە دراوە کە بناغەی تیۆری ( نظری )ی باسەکە روونبکرێتـــەوەو دەربارەی هەندێك بەرهەمیش هەڵویستی رەخنەیی دەربڕ‌ـــراوە • جا بۆ ئەوەی ئەم مەبەسە روونبکرێتەوە ، چەند دێرێك دەربارەی ئەم سێ جـۆرە زانستە پێویستە •

لە جیهانی زانستی ئەمڕۆدا ئەدەبیاتناسی بە زانستێك ئەڵێن کــە هەموو بەشە جیاوازەکانی ئەدەبیاتی هونەرمەندانە بگرێتەوە • مەبەس لە « ئەدەبیاتناسی » ئەوەیە کە کەرەسە بنەڕەتییەکانی تیـــۆریی زانستی پیشانبدات ، ئەوە دەربخات کـــە تیۆریی زانستی چـۆن تەماشای ئەدەبیات ئەکات و لەگەڵ زانست گونجانیا چۆن دەرئەخاتو چۆن ئەو نرخەی کەرەسەکەی ئەدەبیات بە خوێندەواران ئەناسێنێ کە لەبەردەستایە[١] •

ئەدەبیاتناسی سێ بنەڕەتی عیلمیی جیاواز ئەگرێتـــــــەوە :
تیۆریی ئەدەبو رەخنەی ئەدەبیو مێژووی ئەدەب •

تیوریی ئەدەب ـــ زانستێکە تەماشای ئەدەبیاتی هونەرمەندانـــــە ( واتە ـــ نووسینو هۆنراو ) ئەکاتو ئەوە هەڵئەسەنگێنێ کە چۆن ئەو ئەدەبیاتە ، وەبەکامشێوە نـــەخشەیژیـــان ئەکێشێو چۆنی لێ تێئەگات • بە کورتی پڕ بە پڕ گرتنەوە ( استیعاب )ی هونەرمەندانەی ژیانە •

تیۆریی ئەدەب ـــ زانستێکـــە لە رۆڵ و گرنگیی بەرهـــەمی هونەرمەندانە ئەدوێ ، لە رێڕەوی گەشەسەندنی کۆمـــــەڵدا • زانستێکە دەربارەی جـــۆرو شێوەی هونەرمەندانەو رێگـــەکانی دەربڕینیانو پێش هەموو شت لە یاسا گشتییەکانی گەشـــەسەندنی ئەدەبیاتی هونەرمەندانەو خاسیەتو سروشتی کۆمەڵایەتیو ئـــەرکی کۆمەڵایەتیو شێوەو پەیوەندیی ئەدەبیات لەگـــەڵ ژیاندا ئەدوێت •

بۆیە بە شێوەیەکی بەیەکداچـــوو بەستراوە بە ئیستاتیکەوە کـــە ئەویش ئەو زانستەیە کەوا لە شتی جوانی سروشتو کۆمەڵو یاسا گشتییەکانی گەشەسەندنی هونەر ئەکۆڵیتەوەو هـەموو تەجروبەی مێژوویی گەشەسەندنی هونەری مرۆڤایەتی ئەگرێتەوە لە هەمـــوو جیهـــاندا •

تیۆریی ئەدەب تەماشای ئەو جیهان بینینە ئەکات کـــە پێوەندیی بە گەشەسەندنی ژانرو زمانو ستیلو « باس »و نموونە هەڵبژاردنەوە هـەیـــە •

تیۆریی ئەدەب بنەڕەتی لێکۆڵینەوەو نرخپێدان ، بۆ رووداوی ئەدەبیو کەرەسەی ئەدەب دائەنێ ، رادە بۆ سروشتی ئـــــەدەبی هونەرمەندانە ، واتە بۆ بەرهەم دائەنێ ، کە ئەویش بەشێکـــــە لە فۆرمەکانی سەرخانی بیروباوەڕ •

تیۆریی ئەدەب تواناى ئەوەمان ئەداتێ کە زۆر قوولتر لـــــە سروشتە گشتییەکانی خاسیەتی ئەدەبیاتی هونەرمەندانەو رێڕەوی ئەدەبیاتو شتە تایبەتییەکانیو لە خاسیەتی هەموو بەرهـــــەمێکی ئەدەبی بگەین •

تیۆریی ئەدەبی راستەقینە لەوەدا دیاری‌ئەدا کە پـــەیوەندیی بەتینی نێوان ئەدەبیاتو ژیانی گەل یەئخات ، تا ئەدەب پاڵ بـــە گەلەوە بنێت بۆ سەرکەوتنی تازە دەستخستن لە بنیاتنانی کۆمەڵی بەختیاردا •

مەبەسی هەرە گەورەی تیۆریی تازەی ئەدەب ، خزمەتی گەلو هەولدانە بۆ گەشەپێدانی رۆشنبیریی هونەرمەندانەی کۆمەڵ ، بـۆ گەشەپێدانی پراکتیکی (تطبیقی)ی هونەرمەندانەی ئەدەبی نوێ •

تیۆریی ئەدەبی تازە ، زۆر لە مێژووی ئەدەبەوە نزیکـــە • باری گشتیی تیۆریی ئەدەب ، لە خۆیدا خزمەتی مێژونووسانی ئـــەدەب ئەکاتو رێگاو پەیڕەوی لێکۆڵینەوەی بەرهەم دائەنێ •

تیۆریی ئەدەب لە زۆر لە بنەڕەت و لێکۆلینەوەکانیدا پشت بە باشترین دەستکەوتی بیری ڕەخنەگری و شتە بەنرخەکانی لێوورد بوونەوەی ڕەخنەگری ئەبەستێ •

مێژووی ئەدەب بێ تیۆریی ئەدەب نابێ و تیۆریی ئەدەبیش بێ مێژووی ئەدەب نابێ • ئەم دوو پەیڕەوە زانستییە زۆر تونــە بەیەکەوە بەستراون •

ئەمڕۆ ئێمە زۆر فرمانی مەزنمان لەبەردەمدایە بەرامبەربە پــە روەردەکردنی گیانی ئیستاتیکی لەلای خوێندەواران و هونەرمەندان و بۆ بەجێهێنانی ئەرکە هاوچەرخەکانی مێژوو لەم بارەیەوە • ئــەبێ گرنگیی تیۆریی ئەدەب بۆ فراوانترین کۆڕی هونــەرمەندان و خوێندەواران دەربخەین •

تیۆریی ئەدەب لە بنەڕەتە گشتییەکانی خۆیدا پشت بــەو ڕاستییانەوە ئەبەستێ کە لەگەڵ داڕشتنی ئەدەبدا تێکەڵ ئەبن • هەر وەك پشت بــە دەستکەوتــەکانی مێژووی ئەدەوە ئەبــەستێت • بیر ڕوناکە دیموکراتییە شۆرشگێرەکانی سەدەی نۆزدەهەم ، هــە وەك رۆڵێکی گەورەیان لە رووی بیر ڕوناکییەوە بینی ، ئــەو نووسەرانەشیان پەروەردەکرد کە ڕەخنەیان دەربارەی بەرهەمەکانیان ئەنووسی و کۆمەڵێکیش لە خوێنەرانیان پەروەردەکرد •

ڕەخنە یاریدەی خوینەران ئەدات بە ڕاستی لەو بەرهەمانە بگەن کە ئەیخوێننەوەو پڕ بە پڕی خــۆیان بایەخیان بدەنێ ، لــەلایەکی تریشەوە ڕوانینە پلەی بڵندبوونەوەی رادەی نووسینی ئــەدەبی ، یەکێکە لە ئەرکەکانی رەخنەی ئەدەبی ، کە ڕوخساری ڕێك و ناڕێکی بەرهەمێکی ئەدەبی دەستنیشان بکات • ڕەخنە لە داچــەسپاندنی توانای هونەرمەندیاو لە نەهێشتنی هەڵەو ناتەواوی بەرهەمــدا یاریدەی نووسەران ئەدات •

ڕەخنەی هاوەدەمیشمان لەلای گەلێك لە گەلانی جیهــان

رۆلێکی گەورەی هەیە لە گەشەسەندنی ئەدەبدا • ئەبینین ئەمڕۆ لە هەموو وولاتاندا ڕەخنەگران بایەخی خۆیان بە بەرهەمی نووسەرو شاعیرانی پایەبلند ئەدەن و ڕێگانیشیانی ئەدیبانی لاوئەدەن و کەمو کووڕی بەرهەمیان ئەخەنەروو •

بەمجۆرە ، تیۆریی ئەدەب و مێژووی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی ، بەشی بنەڕەتی و گرنگترین بەشی ئەدەبیاتناسین • سەرەڕای ئەمانەش ئەدەبیاتناسی چەند مەیدانێکی یاریدەدەری تریش ئەگرێتەوە ، کە یارمەتیی ئەو سێ بنەڕەتە ئەدەن بۆ ساغکردنەوەی سەرچاوەو گەیشتنە سەر کانی هەڵقوڵینی زۆر بەرهەم • ئەم مەیدانە یاریدەدەرانەش بریتین لە مێژوو نووسینی ئەدەبیاتناسی و تێکستەلۆژی و بیبلۆگرافیا(٢) •

ناوەڕۆکی ئەم کتێبە وەك ووتمان ئەچێتە خانەی مێژووی ئەدەبەوە ، بەلام ناچاری وای کردوە کە هەندێجار خۆی لە بەشەکانی تری ئەدەبیاتناسی لانەدات • چونکە مەبەسی گەورە خزمەتکردنی گەنجینەی نەتەوایەتیمان و قووڵکردنەوەی لێکۆلینەوەیەتی لەم پلە مێژوویی یەی ژیانی نەتەوەیی و ئەدەبی و بیرڕوناکیماندا و لە تواناداهەوڵدراوە کە ئەم باسە لە ڕادەیەکی عیلمیی قوولدا بێت و نیشانەیەکی دیاربێت لەسەر ڕێگەی کاروانی لێکۆلینەوەی ئەدەبەکەماندا • وەك ئەزانین فۆلکلۆری کوردی کۆنترین بەرهەمی ئەدەبیمانەو بناغەیەکی پتەوی گەشەپێدانی ئەدەبی ئەمڕۆمانە ، بۆیە بەرگی یەکەمی ئەم زنجیرەیە بۆ ئەو سامانەی نەتەوەکەمان تەرخانئەکەین •

## فۆلکلۆر چی یە ؟

تا ئێستا ــ لە کوردیدا لە چەند شوێن و کتێب و سەرچاوەیەکدا لەم بارەیەوە نووسراوە • بۆیە لێکدانەوەی ئەم ووشەیەو ڕەگەزو

مانای دووباره ناکەینەوەو بۆ ئەوەی ڕێگــــە بۆ چوونــــە ناوباسی فۆلکلۆری کوردییەوە خۆش بکەین بە چەند ووشەیەك لەم مانایـــە ئەدوێین • هەرچەندە ئەمڕۆ ووشەی لاتینیی فۆلکلۆر زۆر مەیدانی کەلەپووری نەتەوەیی ئەگرێتەوە ، هەر لە پاشماوەکانی جلو بەرگی میللیی کۆنو ئێستاوە تا ڕایەخو هۆی خواردەمەنی تیاخـــواردن ( قاپو قاچاغو کاسەو کـــــەوچك )و تا نەقشو نیگـــارو جۆری خواردەمەنیو گەلێك شتیتر کە شەقڵی تایبەتیی کۆنی میللەتێك لــە بەرهەمێکی دەستکرد یا بەرهەمی بیردا بهێڵێتەوە بەلاَم لــــە کۆڕی ئەدەبدا فۆلکلۆر پڕبەپڕ بۆ ئەوە بەکار ــ ئەهێنرێ کە ئەدەبیاتناسانی هەندێ وولاَت بە بەرهەمی سەر زاری خۆلقێنەرانەی گەلی ناوئەبەن •

ئەم بەرهەمە خولقێنەرانەیە ئەوەیە کە دەماودەم وپشتاو پشت ، کوڕ لە باوکەوە منداڵ لە دایکەوە ئەیبیستیو ئەمێنێتەوە • هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەدەبی فۆلکلۆر بە بەرهەمی تاقەکەسێك دانانرێو ئەدرێتە پاڵ هەموو میللەتو بە بەرهەمی خولقێنـــــەرانەی گەل ئەناسرێو روخـــاری ئاشکرای بریتییە لە سادەیی ــ چ لە رووی زمـــــان و چ لە رووی دەربڕینەوە ، شەقڵی تایبەتیی ئەو گەلـــــە یا ئەو زەمانو دەورەی خۆیی پێوەیە ، نەخوازە لە وێنەو بیردا •

خاسیەتێکی تری فۆلکلۆر ئەوەیە کە لەناو خەلکدا ئێجگار زۆر بلاوە ، لە وولاَتانی ڕۆژهەلاَتدا ، بە تایبەتی لای ئێمە ، وەتــا دەوری بلاوبوونەوەی خوێندەواریو شارەزابوونی خەلك لەگەل ئــەدەبی نووسراودا ، کەمکەس هەیە شتێك لە فۆلکلـــۆری گەلەکــــەی خۆی نەزانێو لەبەری نەبێو بە ووتنو گێڕانەوە دەری نەبڕێ •

فۆلکلۆر کەرەسەیەکی فراوانو دەوڵەمەندە بۆ لێکۆڵینـــەوەی ژیانو زمانو مێژووی هەموو میللەتێك ، تەنانەت کەرەسەشــــە بۆ زانایانی کۆمەڵو کۆمەلاَیەتیو ئەتنۆگرافیاش • ئەدەبیاتنـــــاساز بایەخێکی گەورەیان داوە بەفۆلکلۆر ــ گۆرکی ئەلێ : « لــە ڕووی

بەرهەمەوە یەکەم فەیلەسووف‌و شاعیر میللەت خۆیەتی ، هەر ئەویش بەرهەم‌هێنەرو خولقێنەری ئەو هەموو هۆنراو و داستانەیە کە لە کەلچەری[3] جیهاندا هەیە »[4] . چێرنشێڤکی ئەلێ : « هۆنراوی گەل‌و گۆرانی‌یەکانی ، ژیان‌و مێژوو رەسم‌و عادەتی خەڵکی پاراستوە »[5] . هە روەك گۆرکی ئەلێت « بناغەی ئەدەب لە فۆلکلۆر ــ واتە ــ لە ئەدەبی خەڵکدایە ، فۆلکلۆر کەرەسەیەکی خاوی مەزن‌و کان‌و سەرچاوەیە بۆ هەموو شاعیران‌و نووسەران . گەر بە باشی لە رابوردوو بگەین ، بەرهەمی ئەمرۆمان زۆر رەتگین ئەبێ‌و ئەوسا زۆر بە ووردی لە گرنگی‌ی فۆلکلۆر ئەگەین »[6] .

ئەم ووتانە بەسەر فۆلکلۆری هەموو گەلاندا دێتەدی . زانایانی رۆژهەڵاتناس ، دەربارەی فۆلکلۆری کوردیش گەلێك ووتەیان هەیە کە شایانی تۆمارکردنن .

رۆژهەڵاتناس‌و بیر رووناکی گەورەی ئەرمەنی ئەبۆڤیان ، کە لە سەدەی نوزدەیەمدا بە یەکێك لە رۆشن‌بیرە پێش کەوتن‌خوازە مەزنەکانی رۆژهەڵات ناسراوە نووسیوی‌یە : « هەموو کوردێك ، تەنانەت پیرەمێردە نەخوێندەوارەکانیش گیانی شاعیرانە وا لەناخی دەروونیاندا ، هەموویان لە گۆرانی ووتنا خاوەنی توانان ، زۆر بە سادەیی ، لەسەرخۆ ، گۆرانی ئەلێن . بە دۆڵ‌و چیاو تاڤگەو روبارو گوڵ‌و چەك‌و ئەسپ‌و ئازایەتی‌و کچی جوانی خۆیان‌و بە ئازداریاندا هەڵئەدەن ، ئەمانە هەموو لە قووڵایی هۆش‌و دەروونیانەوە دێتەدەرەوە »[7] .

مار، کە زانایەکی گەورەو زمانەوان‌و رۆژهەڵاتناسێکی ناسراوە، لە ووتارێکدا کە ساڵی ١٩١١ نووسیوی‌یە ، ئەو راستی‌یە دەرئەخات کە فۆلکلۆری کوردی تەنیا لەناو کورد خۆیدا بلاونی‌یە ، بەڵکو لەناو گەلانی تری رۆژهەڵاتیشدا ، وەك عەرەب‌و فارس‌و ئازربایجانی‌و

ئەرمەنی‌و ئاسووری‌دا باوە[8] .

لەم بارەیەوە ــ مێتۆروسکی ئەڵێ :

« لای ئاسووری‌یەکانی چیا ،گۆرانی‌ی کوردی ووتن‌و چیرۆکی کوردی گێڕانەوە ، بۆتە عادەتێکی گشتلایی »[9] .

ڤاسیلی نیکیتین نووسیوی‌یە : « ئــــەدەبی کوردی ــ لە پلەی یەکەمدا ، فۆلکلۆری کوردی‌یە ، لەو فۆلکلۆرەدا هەر تەنیا پاشماوەو میراتی نەوەو پشتەکانی پێشوو نابینرێ ، بەڵکو ئــــەمڕۆش ئـــەو فۆلکلۆرە بەڵگەیە بۆ بە توانایی لــــە ژیانداو بۆ ڕەنگینی‌ی هێزی بەرهەم‌هێنان ، کــــە ڕۆژ بەڕۆژ دەوڵەمـــــەندیی ئەو بەرهەمـــە تازەئەکەنەوەو فراوانترو زیاتری ئەکەن ، ئەوەش دەگمەن نی‌یە ، کــە ڕەگەزی بەرهەمی گەلانی هاوسایە بە گۆرانی بووترێ‌و لــــە قاڵبی کوردیدا داڕێژری »[10] .

ئەبۆڤیان دەربارەی گۆرانی‌ی کوردیش ووتوەتی : « ئـــــەم گۆرانی‌یانە گەیشتوونەتە سنووری پڕی‌و تەواوی »[11] .

گومان لەوەدا نەماوە کە نەتەوەی کورد لە فۆلکلۆردا یەکێکـــــە لە نەتەوە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان ، هۆی ئەمەش تەنیا ئەوە نی‌یە کــــە ئەدەبیاتی نووسراو نەختێك درەنگ لەناو کورددا پــــەیدا بوویێت[12] . بەڵکو ژیانی تایبەتی‌ی گەلی کوردو وێنەی جیـــاوازو گۆڕرانی زوو بە زوو لـــــەم وێنانــــەدا ، بوونەتە هۆی ئــــەم دەوڵەمەندی‌یە ، هەر وەك بوونی چــــەند دیالێکتێك هێنــــدەی‌تر دەوڵەمەندی کردووە . هەروەها زروفی تایبەتی وای کردووە کە بەشی زۆری ئەدەبی میللی بەناوی خاوەنەکەیەوە . بلاونەبێتەوەو ئــەوەش دەماودەم‌و پشتاوپشت بمێنێتــــەوەو بچێتـــە سەر گــــەنجینەی فۆلکلۆرمان .

## بەشەکانی ئـــەدەبی فۆلکلۆری کوردی :

ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیش هەر وەك ئەم ئەدەبــــە لەلای زوربەی گەلانو بە تایبەتی لای گەلانی ڕۆژهەڵات • بریتی‌یە لـــە چەند جۆرێکی بنەڕەتی‌ی وەك : ئەفسانە ، ئیپۆسیا ، کە هـــەندێ جۆری لە کوردی‌دا پێی ئەووترێ « بەیت » • ئەمیش ئەبێ بـــە دوو بەشەوە : بەیتی قارەمانی‌گێڕانەوەو بەیتی بەسەرهاتی دلداری‌و ئەڤین‌گێڕانەوە • وە وەك چیرۆك ، واتە ( حیکایەت ) ، کە لە هەندێ لا « نەقڵ ــوـ مەتەڵوك »یشی پێ‌ئەڵێن ، وە هۆنراوی لیریك ، کـە هەموو بەشەکانی گۆرانی ئەگرێتەوە ، وەك لای‌لایەی منـــداڵو لاواندنەوەش ئەگرێتەوە • هەروەك ئەدەبی فۆلکلـــۆری کوردی گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی پەندی‌پێشینانو قســـەی‌نەستـــەق‌و گاڵتەوگەپو مەتەڵیشی هەیە •

**ئەفســـــانە :**

هەندێ لە زانایان ناوی « میتۆ لۆژیا » یان بۆ عیلمێکی تایبەتی داناوە کە لە ئەفسانە ئەدوێ[١٣] • بەڵام « میتۆ لۆژیا » ئەوەیە کە لە ڕێگەی ئەفسانەوە بە دوای باوەڕو ئاینی کۆن وتازەی گـــەلاندا ئەگەڕێت‌و بە چاویلکەی ئەدەب نارِوانێتە ئەفســـانە • بۆیە زانایانو ڕۆژهەڵاتناسانی وەك مارِو نیکیتین‌و مینۆروسکی‌و ســــمینوڤ‌و ڤیلچێیفسکی‌و لاسکو ، هەروەها نووسەری گەورەی کورد عــەرەب شەمۆ ، بگرە ( ئەبۆڤیان )یش ، ئەفسانەیان کردوە بە کەرەســـەیەك بۆ ساغ‌کردنەوەی هەندێ بیروباوەڕی ئاینی‌ی ــ کـــۆن‌و تازەـی کورد[١٤] • ئەمانە زۆر لە وێنەی « دێوو درنج‌و پەری‌و ڕۆژو مانگ‌و بەردو درەخت‌و هەندێ جانەوەر ، بە تایبەتی لە وێنـــەی مار دواون لە ئەفسانەی کوردیدا • ئەفسانە ــ لە فۆلکلۆری گەلاندا ، بــــە شتێکی کۆن ئەژمێررێ ، چونکە بەرهەمی ئەو کاتەیە کە ئادەمیـزاد

دەستەوسانو بێدەسەڵات ڕووبەڕووی سروشت ئەوەستاو هیچ ڕووداوێکی سروشتی بە ڕێکی بۆ لێك نە ئەدرایەوەو تێی نەئەگەیشتو دەسەڵاتیشي بە سەریا نەبوو ، بۆیە دەرگای بۆ بیرکردنەوەو خەیاڵ ئەخستە سەرپشتو بەو جۆرەی کە ئەم ئەفسانانەی لێ هاتەبەرهەم ، هەموو شتی لێك ئەدایەوە . واتە شێوەیەکی سادەی لێکدانەوەی ڕووداوەکانی سروشت ئەخاتەبەردەست . هەندێ زانا لایان وایە ـ چونکە ئەم ئەفسانانە بەرهەمی سەرەتای ژیانی ئادەمیزادن ، واتە سەردەمی منداڵی ژیانی مرۆڤایەتی ، بۆیە لە هەستی منداڵەوە نزیکنو منداڵ حەز لەم چیرۆکانە دەکەنو لە یادیان ناچێت .

گەر لە کونجی فەلسەفەوە بڕوانینە ئەفسانە ، ئەتوانین بە جۆرێکی هوشیاریی کومەڵایەتیی دابنێین . هەر وەك بە هەوڵدانێکی سەرەتایی مرۆڤ ئەزانرێ بۆ ئەوەی لە جیهان بگاتو جیهان بناسێت .

لە ئەفسانەی یۆنانییەکانی کۆندا هەر شتە خوای تایبەتیی خۆی هەبوو ، وەك خوای جوانیو خوای هونەرو شیعرو بارانو گەلێك ڕووداوی تری سروشت . بەڵام دیمەنێکی ئەفسانەی کۆنی یونان ، لە ئەفسانەی گەلێك میللەتی تریشدا بەدی ئەکرێ ، بە تایبەتی لە ئەفسانەی کوردیدا . ئەویش ئەوەیە کە ئادەمیزاد ـ یا بڵێین مرۆڤ یا ئینسان ، لە ئەنجامدا خۆی قارەمانی سەرکەوتووی ئەفسانەیە . جاروبار لە ئەفسانەی کۆنی یوناندا کێشە ـ ئەکەوێتە نێوان قارەمانی تراگیدیاو نێوان خواکانی یۆنانی خۆیانەوە . هەر وەك لە « تراگیدیا »ی پرۆمیتیۆس(١٥) دایە ، کەوا ئەفسانەی یۆنانی بە باپیرەگەورەی ئادەمیزادی ئەزانێو لەو تراگیدیایەدا ئەفسانەکە ئەڵێ ، پرۆمیتیۆس پارچەیەك لە ڕۆژی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو . خاوەن بیرەکان ئەم وێنەی « ڕۆژ »ە بە دوو جۆر لێك ئەدەنەوە . هەندێکیان بەو سێوەی دائەنێن کە ئاینە ئاسمانییەکان ئەڵێن ،

« ئادەم » خواردیو بەو هۆیەوە لە بەهەشت دەرکرا • هەندێك ئــەم پارچە ڕۆژە بە وێنەی « زانیاری » دائەنێن •

ئەفسانەکە ئەڵێ : (زیۆس)ی خوداوەندی گــــەورەی یۆنان ، بۆیە لە پرۆمیتیۆس توورەبوو ، چونکە ئەو پارچــــە ڕۆژەی دزیبوو بەلاّم هەندێك ئەلێن ، زیۆس خۆی لە هەموو شت زیاتر لە «زانیاری» ئەترسا ، چونکە مێشکی ئادەمیزادی ڕوون ئەکردەوەو وای ئەکرد کە لێی یاخیبین • بۆیە زیۆس « فەرمانی » بە (هیفایستۆس)ی خــوای ئاسنگەرانی یۆنان دا کە پرۆمیـتیۆس لە چیاکانی قەفقاسدا بە بەردێکی داچەسپیوەوە ببەستێتەوەو بزمار بە دەستو قاچیشیدا داکــــوتێ • زیۆس پاش ئەمە هەموو ڕۆژ ــ هەڵۆ ــ یـــەکی ئەنارد بە درێژایی ڕۆژ جگەری پرۆمیتیۆسی ئەخواردو بە شەو بەجێی ئەهێشــــت ، بەلاّم جگەر لەخۆیەوە پەیدا ئەبۆوەو سەر لە بەیانی هـــەڵۆ دەستی ئەدایەوە کاری‌خۆی ، خواوراستان لە ئەنجامدا قارەمانێك کە لــــە « ئادەمیزاد » بوو ناوی « هەرقل » بوو توانی پرۆمیتیۆس لــــەم ئازارە ڕزگاربکات • تیرێکی نا بە هەڵۆکەوەو خستیو پێـــوەندی دەستو پێی ئەو لاشە ئازاردراوەی کردەوە(١٦) •

ئەم جۆرە وێنەیەی ئەفسانەی کۆنی یۆنان لە ئەفسانـــــەی کوردیشدا زۆر بەدی ئەکرێ زۆرجار ئەبینین قارەمانی ئەفسانە ، کە لە ئادەمیزادە ئەکەوێتە داوی دێوو درنجەوەو هەر ئادەمیــــزادو پیاوچاك رزگاری ئەکەن ••

ئۆبرەزی ــ گەورە لە ئەفسانەی کوردیدا ، ئۆبرەزی «دێو»ە ، بەلاّم قارەمانی سەرکەوتوو لە ئەنجامدا هەر ئادەمیزادە •

ئەفسانەی کوردی وێنەی کێشەی نێوان دێوودرنجو ئادەمیزاد ئەکات بە نیشانەی ئەو کێشەیەی لە زۆر کۆنەوە لە کۆمــــەڵی ئادەمیزاداو لە نێوان هێزی چاکەو خراپەدا ، یا هێزی خێرخــــواو هێزی خراپەو بەدیدا بەرپابووە •

لەم کێشەیەدا هێزی خێرخوا کە بریتی‌یە لە ئادەمیزادو ئەمە وێنەی میللەتە ، هەموو شوێنێکی گرتۆتەوە ، لە هەموو شوێنێکدا هەیەو بێ‌ترس لە ژێر تیشکی ڕۆژدا ئەژی‌و هەر چاکەو خۆشەویستی‌ی بنیادناوە بەڵام هێزی خراپەو بەدی ، کەمەو لە تاریکیدا ئەژی ، لە ئەشکەوت‌و کۆڵانی تاریکدا ، لە کەلاوەی کۆن‌و وێرانەدا ، لە تیشکی ڕۆژ زۆر ئەترسی‌و هەر ڕۆژهەڵهات ئەو وون‌ئەبێت ، واتە لەو پارچە ڕۆژی «زانیاری»یەی ئەفسانەی کۆنی یۆنان ئەترسێت •

ڕوخساری ئەم هێزی خراپەیە لە ئەفسانەی کوردیدا وەك خۆی نەماوە ، بەڵکو هەندێ شتی ئاینی‌تازەشی تێکەڵ کراوە ، بۆ نموونە : لە ئەفسانەی‌کوردی‌دا ئەڵێ : کەوا گیانی بەد ــ دێو‌و درنج‌و خێو ــ لە مانگی رەمەزاندا هەموو لەو دیو کێوی «قاف»ەوە ئەبەسترێنەوە ، تاوەکو لەو مانگەدا خەڵکی لە خراپەیان ڕزگاربن‌و ئاسوودەو بەختیار ، دوور لە گیانی بەدیان بژین • کێوی «قاف»یش لێرەدا دیارە کە هەر چیای « قەفقاس »ەکەی ئەفسانەی یۆنانە ، کە ئەو دەمە ئەوپەڕی زەمین بووە لە زانینی گەلدا •

هەروەها ، وێنەی « مار » لە ئەفسانەی کوردیدا وێنەیەکی تری هێزی خراپەیە ، زانایانی « میتۆلۆژیا » ئەمە ئەبەستن بە باوەڕی کۆنی ئاینەوە • وا دیارە ئەم وێنە خراپەی مار لە ئەفسانەی کوردی‌دا هەر ئەو وێنە کۆنەیە کە ئەفسانەی کۆنی یۆنان دەربارەی ئەو مارەی ئەگێڕێتەوە کە ( ئەهریمەن ــ یا ئیبلیس )ی بردە بەهەشتەوە تا ئادەم هەڵخەڵەتێنێ •

وێنەی «مار» لە فۆلکلۆری کوردی‌یاو لە چیرۆکی بەناوبانگی «ئەژدەهاك» یا « زوحاك »یشدا هەر ئەو وێنەیەی خراپی‌و بەدی‌یە • وە لە وێوە دێتە حیکایەتیشەوە ، وەك حیکایەتی مارەکەی شێخ‌هۆمەر ، کە پەندی « چاکە لەگەڵ ناکەس بەچە مەکە»ی لێوە پەیدابوەو ڕەنگە « شەرعی مار بەدار »یش هەر لەوێوە هاتبێ •

له ئەفسانەی کوردیدا قارەمانی سەرکەوتوو هەمیشە لە ئادەمیزادە ، زۆرتریش لە هەژارو ڕەنجکێشە • ئەم قارەمانە سەری « دێو »ی ئەفسانە ئەپلیشێنێتەوە ، بەڵام زۆرجاریش ئەوە ئەزانێت که «دێو» هەر ئەو لاشەیە نیيە ، بەڵکو « کولەکەی ڕۆح »ی هەیە ، واتە هێزی بەد بناغەیەکی هەیە لە ژیانی کۆمەڵایەتیداو ئەبێ ئەو بناغەیە نەهێڵرێ • بۆیە قارەمانی ئەفسانە هەمیشە هەوڵی ئەوەیەتی کە « کولەکەی ڕۆح »ی « دێو »ەکە بشکێنێ‌و بەو جۆرە لەناوی بەرێت •

هێزی خراپە ــ لە ئەفسانەی کوردیدا جاروبار ئادەمیزاد هەڵئەخەڵەتێنێ‌و ئەو مرۆڤە بە هەموو هێزیەوە هەوڵی ڕزگاربوون ئەدات لەو داوەی کە تێی کەوتووە ، بەڵام ئەو دێوەکەمتر چاکەی لە دەستدێت •

لە ئەفسانەی کوردیداو تەنانەت لە حیکایەتیشدا ، هێزی خراپە هەر ڕووەو نەمان ئەڕوات • بۆیە ئەبینین کە هێزی خراپە گەر لە وێنەی « دێوو درنج »یشدا نەبێت ، ئەوا لە وێنەی پیرێژنێکی ڕەموزنی ئێسكقورسدا دێتەکایەوە • ئەنجامی پیرێژنی « فەرهاد کوژ »یش هەر مردنە •

لەپاڵ ئەم هێزی خراپەیەشدا ئەبینین کە وێنەیتر هەیە • وێنەی هێزی چاکەو خێرخوا • کە ئەمیش ئەفسانەی کوردی « پەری »ی ناولێئەنێ‌و پەری چاکە لەگەڵ ئادەمیزادا ئەکات • هەر لە ئەفسانەدا جاروبار ئادەمیزادی خراپیش دێتەکایەوە بەڵام ئەو پیاوخراپە ، هەمیشە لە شێوەی زۆردارو پادشای بەجەزرەبەدا خۆی ئەنوێنێ •

لە تاقە ئەفسانەیەکی درێژی کوردیدا کە لە « مێژووی ئەدەبی کوردی »دا تۆمارەکراوە ، ئەبینین کچی شای‌پەریان ڕوو ئەکاتە یەکێك لەم پاشا خراپەکەرانەو ئەڵێ :

« شارۆخشا ، ئادەمیزاد هەرشتێکیان لەگەڵ بکەی بەخۆڕایی

ئەڕوا • چونکە شتیان لەبەرچـــاو نی‌یەو کە کەوتن بەســـەرئیشی.
خۆیانا ئیتر هیچیان لەبەرچاو نامێنێ »[١٧] •

لەم ئەفسانانەدا هێـــزی بەد دەگمەن لە ئادەمیزادە • بـــەڵام پیاوچاك زۆرجار لە نزیك ئادەمیزادەوە لە گەنجینەی ماڵدا یا لـــە کووچەیەکی خانوودا ئەژی‌و خاوەن ماڵ ئومێدی چاکەی پێ‌یەتی •

لە ئەفسانەی کوردیدا ئۆبرەزی دێو هەر بۆ بەدخواهی‌یـــە ، گەر لە هەندێ ئەفسانەی کوردیدا دێو ببێتە ئۆبرەز بۆ چاکـەکردن ، ئەوە تەواو ئەو وێنەیە پاشماوەی کۆنی ئەفسانەی پێش ئیسلامـەو کەوتۆتە کوردی‌یەوە • تەنانەت لەم ئەفسانانەشدا هەر ئادەمیـــزاد ئەبێتەوە بە قارەمان • چونکە لەوێدا دێو بە زەبری دانایی«سولەیمانی حەکیم » هاتۆتە ژێر ڕکێفی چاکەکردنەوە • ســـولەیمان کـــە ئادەمیزادێکی دانایە ، بە ژیری‌و توانایی‌و دانایی خـــۆی سەری پێ‌شۆڕکردوون‌و خستوونی‌یە کەمینی خۆیەوەو کرداری چاکـــەیان پێ‌ئەکات • گەر ئەو نەبێت ئەوا ئەچنەوە سەرکرداری بەدی خۆیان‌و خراپە لەگەڵ بەرەی ئادەمیزادا ئەکەن •

بەرامبەر بەم وێنەیە ، لە ئەفسانەی کوردی‌دا وێنەیەکی چاکـەو خێرخواهیش ئەبینین کە « خدری زیندەیە » • ئەفســـانەی کوردی ئەم پیاوچاکە لە وێنەی ئادەمیزادا پیشان‌ئەدات •

پیرێکی نەمر کە تا ئاسمان‌و زەوی مابێت هەر ئەمێنێ ، واتـە هێزی چاکەو خێرخوا هەر ئەمێنێ‌و فەوتانی بۆنی‌یە ، کـەچی هێزی خراپە هەر لەنەمانە •

« خدری زیندە » نامرێ ، لە هەموو شوێنێك هەرموو هەڵکڕوزێنیت ئامادەیە ، بە دەم لێ‌قەوماوانەوە دێت • یاریدەی هەژاران ئـەدات ، ڕێگا نیشانی گومڕایان‌و سەر لێ‌شێواوان ئەدات • زۆرجار ڕێگـەی ڕاست ، ڕێگەی چاکەکردن‌و واز لەزۆرداری هێنان نیشـــانی میرو پادشایان ئەدات •

ئەم وێنەیەی خێراخوایی هەر بە ناوی « خزر »ەوە لای گەلێك نەتەوەی ڕۆژهەڵات هەیەو هەندێ لە فۆلکلۆرناسان ئەیبەنەوەسەر ئاینەکانی پێش ئیسلام . هە رچەندە زۆر لەوانەش کە تەفسیری قورئانیان کردووە ، بەو پیاوچاکەی دائەنێن کە لە سورەتی (کەهف)دا باسی کراوەو،کەوا لە گەڵ حەزرەتی موسادا یەکیان گرتوەو چیرۆکێکی سەیر لە نێوانیانا ڕووی داوە ، کە بە یەکێك لە چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز ئەزانرێ.، ئایەتەکەی کە بە بوونی خدری زیندە لێك‌ئەدرێتەوە ئەوەیە کە ئەفەرموێ « فوجدا عبدا من عبادنا آتیناه رحمة من عندنا وعلمناه من لدنا علما »[18] .

لە داستانی « مەمی ئالان » دا ، کە سێ براکەی میری « باژاری مەغریب »[19] لەتاو ئەوەی کە هیچیان کوڕێکیان نیە جێگەیان بگرێتەوە ، سەری‌خۆیان هەڵئەگرن‌و لە جەژنی قوربانا دیوەخان بەجێ‌ئەهێڵن‌و بەرگی دەروێشی ئەپۆشن‌و ئەڕۆن . خواوڕاستان ئەو پیاوچاکەی ئەفسانەی کوردی دێت بەپیریانەوە : « خواس م سێر »

... هەر سێ برا ڕوونیشتنێو دلێوان بوان شەوتیو ژ خەومرا گریانە .

ڕەبی ئالەمێ خوجەیی خدر لە وان کر بەیانە .

جارەکی نێری کو ئەلیبەگ ، ئەمەر بەگێ ئەڵامازبەگ ژ خورا ڕونشتنەو گریانە .

دلی وی ب وان شەوتی .

سبقەکی ژ پاشلا خو دەردخە دەدە دەستێ ئەلیبەگی مەزنێ برانە.

دبێ : گەلی برا مەگرین ، ڕەبێ ئالەمێ دەلیلی هەیریانە . ئێرو ڕوژا جەژنا قوربانێیە . وە دەف ژ قوناغێن خو بەردانە . گەرەك ژەلامێ مینا وە قەکرانا دەقی خەزیناو دەفینی گرانە ، وە پەرە بڕژانەنا ، گەلی برا لکولاناو لکوچانە . ژ بونا خاتری فەقیرو فوقەرانا .

ئەفسا کو برچی‌یە ، گەرەك وە تێربکرا ، وە پەیا کو تازی‌یە گەرەك وە ب جل‌بکرا .

هوون هاتنە کەتنە چوڵو کەربەلانە .

وە لە خو کری‌یە جلی دەروێشانە .

وه رابن بەری خۆ بدەن بازاڕی مەغریبیو خانیێن خۆیی گرانە •
هەڕن بازاڕی مەغریبێ ، فەکەن دەفی خەزێناو دەفینانە •
پەران برژێنن لە زوکاکاو نکووچانە •
سەر ژێ بکەن قوربانو دەهیانە •
ژ بۆ خاتری فەقیرو فوقەرانە[٢٠] •

ئەوە بوو هەر سێ برا گەڕانەوە « بازاڕی مەغریب »و بە قسەی ئەویان کرد ، کوڕێکیان بوو ، لەسەر داواکەی خۆی ناویان نەنا تا « خدر »ی پیاوچاك خۆی هاتەوە لایان ، ناوی نا « مەمی ئالان »و بەو جۆرە چیرۆکەکە دەست پێ ئەکات •

لە ئەفسانەی کوردیدا ، گەر ئەم وێنەی چاکیەو ئەو سێوی پاشـلە لای خدری زیندەش نەبێت ، ئەوا وێنەکە هەر ئادەمیزادەو ، دەروێشێکی هەژارو بەرگ شڕەو کەشکۆڵو عەسایەکی هەلگرتووەو کرداری چاك ئەکات •

## چیرۆك ، سەرگوزەشتە :

چیرۆك ـ کە لە ناو کورددا حیکایەت یا « نەقڵ »ی پێ ئەڵێنو لەناو کوردی لوڕدا ـ مەتەڵۆك ـیشی پێ ئەوترێ • بەشێکی گەورەیە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی •

چیرۆك ، بەرەوپێش چوونێکی مێژوویی ئەفسانەیەو لە ڕووی فۆرمو داڕشتنەوە لەو ئەچێت • هەرچەندە لە ڕووی کەرەسەو ناوەڕۆکەوە هەندێ جیاوازییان هەیە •

کەرەسەی ئەفسانە لە خەیاڵو پڕوپووچەوە وەرگیراوە ، بەڵام کەرەسەی چیرۆك لە ژیانەوە وەرئەگیرێ • کەرەسەی چیرۆکی کوردی هەر گیان لەبەرە ، ئیتر یا ئاژەڵە ، یا مەلو باڵندەیەو ، بەشی گەورەی کەرەسەکەشی ئادەمیزاد خۆیەتی •

چیرۆکیش وەك ئەفسانە ، دەماموەدەمو پشتاوپشت ئەگێڕرێتەوە ، هەر حیکایەتخوانە ( چیرۆكبێژ )ە ، ووشەی

تایبەتی‌ی خۆی هەیە لە دارشتنیا • هەندێ جار لە رووی خـــەیاڵەوە چیرۆکیش ئەچێتەوە سەر ئەفسانە ، هەرچەندە خەیاڵەکەی چیرۆك زۆر لە ژیان دوورناکەوێتەوە ، با قارەمـــانەکەی چیرۆك هـــەندێ کاریش بکات کە لە وزەی مرۆڤدا نەبێ •

تێکڕا ، کەسانێ کـــە لە چیرۆکدا نیشان ئەدرێن کــەس یا گیانلەبەری خەیاڵی نین • با هەندێ کردەوەشیان دووربێت لەوەی کەلەراستی‌ی ژیان خۆیدا هەیە • ئەمەیان خـــەیاڵی هێنـــانەدی کرداری گەورە گەورەیە ، کە ئاواتی ئادەمیزادە ، ئاواتی گەلە ، کە بەرەوژیانی بەختیار بڕوات‌و ژیانی بەختیار بنیادبنێت • جا لـــەو پلەیەی مێژووی گەلدا کە ئەو چیرۆکانەی تیادا هاتۆتەکایەوە ، کـە لە ژیانی ڕاستەقینەدا توانای هێنانەدی ئەو شتانە نەبووە ، ئـــەوا ئادەمیزاد بە باڵی خەیاڵ بەرەو ئەو ئاواتە رۆیشتووە •

چیرۆك بەرهەمی گەورەبوون‌و لە سەرەخسینی مرۆڤایەتی‌یە • دیمەنی کێشەی ئادەمیزاد لەگـــەڵ سروشتداو ئادەمیزاد لـــەناو خۆیاندا ، لە پێناوی ژیانا پیشان ئەدات •

هەندێ چیرۆك باسی ڕووداوێکی مێژوو ئەگێڕێتەوە کە لـــــە لای میللەت‌و لە یادیا پەیکەرێکی جێ‌هێشتوە • ئەم جۆرە چیرۆکە خەیاڵی ئەفسانەی لەگەڵدا تێکەڵ ئەکرێ • بەلام لە گەڵ ئەوەشـــدا ، ئێستاش لە ئەدەبی فۆلکلۆری گەلاندا هەر بەرهەم دێت •

لە ڕووی فۆرمی هونەرمەندانەوە ، سەرگوزەشتە ، زۆر درێژ نابێت‌و شێوەکەی زۆر ئالۆز نی‌یە ، هەر وەك ئەو کەسانەی لـــە چیرۆکەکەدا پیشان ئەدرێن بە ژمارە زۆرنین • هـــەندێ جار ئەم سەرگوزەشتانە بـــە هۆنراو ڕووداوی ڕاستەقینەی ژیانی گـــەل ئەخەنەڕوو •

ئەو چیرۆکانەش کە دەربارەی گیـــانلەبەری ترن ، ئـــەوە یا دەربڕینی خەیاڵ‌و بیرکردنەوەی گەلن ، یا سامبول (نیشانە،رەمز)ن •

گەر تەختێ لەو چیرۆکانە ووردبینەوە کە نووسراونەتەوە یا بیرێك لەوانە بکەینەوە کە لە کاتی منداڵیدا بیستوومانن ، ئەتوانین بڵێین هەر دوو ڕووێ ئەگونجێ تیایانا •

ئادەمیزاد لە چەرخێکدا چیرۆکی بەدەم جانەوەرو ئاژەڵو باڵندەوە هەڵبەستوە ، کە لێکدانەوەی عیلمیی دووربووە لە جیهانی گیانلەبەرانیتر ، شتێکی دەگمەن نییە کە چیرۆکبێژی کورد سەرگوزەشتەی یەکێك ئەگێڕێتەوە بڵێت : زمانی هەموو گیان لەبەرێکی ئەزانی • کەواتە تا ئەو کاتە ئادەمیزاد وایزانیوە کە گیانلەبەری تر زمانی تایبەتیی خۆی هەیە ، نەڕەی شێرو زیقەی چۆلەکەو زیڕەی پلنگو خوێندنی بولبول ، مانای تایبەتییان تیایەو خۆیان یا ئادەمیزادێ کە زمانی گیانلەبەرانیتر ئەزانێ تێیان ئەگات• بەم جۆرە هەموو ڕووداوێك کە لە ژیانی گیانلەبەرانیتردا ئەبینرێ کراوە بە ڕەوالەتو ڕاستییەکەی بە زمانی کەسێکەوە ئەگێڕێتەوە کە زمانی ئەو گیانلەبەرانە ئەزانێت •

ئەمە ڕوویەك ـ ڕووەکەیتر ئەوەیە کە ئەم جانەوەرو ئاژەڵو باڵندەیە تەنیا نیشانەبنو لەودیو پەردەوەو بە ناوی ئەمانەوە ژیانی ڕاستەقینەی کۆمەڵو ئادەمیزاد بخرێتەروو • ئەم جۆرە چیرۆکانە لە ئەدەبیاتی زوربەی گەلاندا هەن ، چ لە ئەدەبیاتی نووسراوداو چ لە فۆلکلۆردا • « کلیلەو دیمنە » کە بە میراتێك ئەژمێرری بۆ هەموو گەلانی ڕۆژهەڵات ، نموونەی بەرزی ئەم وێژەیەیە •

شێر ـ وێنەی پادشایە ـ زۆر کاتیش هەر دڕندەیەو سروشتی جانەوەرانەی خۆی تێك نادات • ڕێوی ـ وەزیر ـ یا دەستو پێوەندی فێڵبازو مەرایی‌کەرەو هەمیشە ڕێگای خراپە نشانی گەورەکەی ئەدات •

ئەم چیرۆکانە ئەمڕۆش لە ئەدەبیاتی جیهاندا ، تەنانەت لە ئەدەبیاتی ریالیزمی ( واقیعی )شدا ئەبینرێن • ئەم چیرۆکانە لە

بەرگی ئـــەمڕۆیاندا پـــەرەپێداتێکی وێنەی جانـــەوەرو ئاژەڵو باڵندەکەی ئەدەبی فۆلکلۆری گەلە •

بە کورتی ئەم چیرۆکانە شەقڵی تایبەتیی دەورێکیان پێوەیـە کە ئادەمیزاد ووردە ووردە شارەزای ئەم گیـــانلەبەرانە بووەو کەوتۆتە ماڵیکردنیانو نەترسی لە زوربەیان ماوە ، نە لە پێکهـاتنو پەیدابوونو دروستبوونیان سەریسوورماوە ، واتـە تیۆری زانین لەکۆڕی فەلسەفەی شارەزابوونی جیهانا پلەیەکیتر چۆتە پێشەوە •

بۆ چیرۆکی کوردیش ، وەك ووتمـــان ئادەمیزاد قارەمانی بنەڕەتییەتی • گەلی کورد ، هەر لە بـــەرگی ئەم ئادەمیـــزادەی ناوچیرۆکدا ، گیانی ڕاستەقینەی خۆی پیشانئەدات • قارەمانەکـە لە ژیاندا مەبەسێکی هەیە ، لە پێناوی ئەو مەبەسەدا کۆڵدان نازانێت• ڕێگەی حەوت شەو و حەوت ڕۆژ ئەگرێتە بەر • حەوت کاڵای ئاسـن لە پێیدا ووردو خاش ئەبێت ، تا ئەگاتە مەبەس • مەبەسیش لـە زۆر کاتدا ژیانی بەختیارە • پاروە نانێکە کە بە ڕەنجو ئازار پـەیداکرابێت نەك بە دانیشتنی سایسێبەر •

هەر بەشە لە ئەدەبی گـــەل ، ڕوخسارێکی سروشتی گـــەل پیشانئەدات • چیرۆکی کوردیش کوڵنەدانو وەفاداریو بە ئەمەگیو ژیریی نەتەوەکەمان ئەخاتەڕوو • بۆ نموونە[31] : چیرۆکی بەرگەردو فەرگەرد[32] و چیرۆکی بەختیارو بەدبـــەخت[33] ، هەردووکیـان سەرگوزەشتەی هەوڵدانن لە پێناوی پاروەناندا • خەیاڵی ڕۆمانتیکی قارەمانی چیرۆك بە ڕێگەی نەهـــاتائەبەن ، پاش ئـــەوەی لە ژیانی کلۆلیو بێدەرەتانی وەڕسئەبن • کوناوکونو شارەوشار بۆ پارووی نان ــ بۆ ژیانێکی بەدەرەتان خۆیان فڕێئەدەنە ئاو و ئاگرەوە •

ئەم خەیاڵە لە سەرەتاوە تا ئەنجام ــ کۆڵەکەی چیروکەکانە ، بۆیە بە ڕێکەوت قارەمانی چیرۆك ئەکەوێ بەسەر کوپە زێرداو ئەکەوێتـە بەختیارییەوە[34] • هەرچەندە ئەنجام ئەمەیە بەڵام ئەم چیرۆکانە هەر

له کۆڕی ڕەنج‌کێشانەوە هەڵئەقوڵێن‌و لەو ئەتمسفێرەدا[٢٥] ئـەژین‌و ئەگەنە ئەو ئەنجامەی پەندی‌پێشینانی بەناوبانگی کوردان « دەسـتی ماندوو لەسەر زگی تێرە » دەریان ئەبڕێ •

ئەم چیرۆکانە ئەوە دەرئەخەن کە پیاو بە ئیش‌وهەوڵدان نـەبێت ناگات بە ئامانج ، وە گیانی سست‌نەبوون‌و ورە بەرنەدان لە پیـاودا بەهێز ئەکەن •

* لەم چیرۆکانەدا هەمیشە دڵپاکی‌و خێرخوایی‌و چـاکەو ژیری‌و ووردبینی بەسەر ناپاکی‌و پیسی‌و هەڵەشەیی‌دا سەرئەکەوێت :

••• پیاوەکە کە ئەمەیان لێ ئەبیسێ‌و چاوی بەو دیمەنە ئەکەوێ ، پەنجەی خۆی ئەگەزێ‌و لە دڵی خۆیدا ئەڵێ : « لێك‌نەدانـەوەو دوای کلاوی بابردوو کەوتن ، کارەساتی لەوە گەورەتریش بەسـەر مرۆڤدا ئەهێنێ • چاك وایە ژیری بە کاربهێنم‌و بە هەر ڕەنگێ بێ شیوەنەکەیان پێ بەر بدەم‌و بیان‌بەمەوە ماڵێ »[٢٦] •

چیرۆکی کوردی تەراو بە ژیانی گەلەوەلکاوە ، لە ژیاندا هەوڵدان ، لە هەوڵدانا کوڵ‌نەدان ، لە کاردا بەردەوامی‌و ساردی نەزانین ، لـە ئەڤین‌و دلداری‌دا وەفاداری ، لە مەبەسدا سووربوون لەسەر گەیشتنە ئامانج • ئەمانە سروشتی مێژوویی نەتەوەی ئێمەن‌و بە سادەیی‌یەکـەی خۆیان ڕێگەیان بەرەو ئەو بەرهەمە ڕەنگینەی گەل گرتۆتەبەر کـە چیرۆکی پێ‌ئەڵێن • خوینەرەوەی کوردو بێگانە لە هەموو چیرۆکێکی کوردی‌دا ئەتوانێ ئەم ڕەگەزە بەدی‌بکات‌و لە یەکیان جیـابکاتەوەو بیانکاتە کەرەسەی لێکۆڵینەوەی وێژەیی‌و کۆمەلایەتی • ئەم چیروکە کوردی‌یانە هەر بەرهەمی خەیاڵ نین ، تەنانەت هەر خەیاڵێکیش نین کە لە ژیانەوە وەرگیرابن ، وەك لە زۆر بەرهەمی ئەدەبی نووسـراودا ئەبینرێن • بەڵکو زۆر جار چیرۆك ڕووداوی مێژوویی ئەگێڕێتـەوە ، یا ژیانی ڕاستەقینەی کەسێك یا قارەمانێك یا فەرمانڕەوایەك ئەگێڕێتەوە کە لە مێژوودا ناسراوێت • وە پێویستیش‌نی‌یە ، بەڵکو ناشێ کـە

گتوومت سەرگوزەشتەکە چۆن رووی‌داوە هەروەها بگێڕرێتەوە •
بەڵکو خەیاڵی چیرۆك‌بێژو سەر گوزەشتە گێڕەرەوەکەو ئەو کەسانەی دوای ئەو ( پشتاوپشت ) ئەیگێڕنەوە ، شتی‌تازەی ئەخەنە سەرو خەیاڵی تێکەڵ‌ئەکەن • بە کورتی دیمەنێکی خەیاڵو لێ‌فراوان‌کردنی میللەتیشی تیایە • بۆیە ئەبینین رووداوێکی مێژوویی ، یا سەرگوزەشتەی کەسێك ، زۆر زل ئەکرێت ، وە گەلێك کردەوەی بەئەقڵدانەچوو ئەدرێتە پاڵ قارەمانی چیرۆکەکە •

سەرگوزەشتەی قارەمانێتی‌ی کوردی ، زۆر لە چیرۆك زیاتر شەقڵی تایبەتی‌ی نەتەوەی کوردی پێوەیە • نموونەی بەرزی نووسینەوەو پوختەکردنەوەی ئەم سەرگوزەشتانە « دوانزە سوارەی مەریوان »[٣٧] و« مەحموود ئاغای شیوەکەڵو»[٣٨] « شەریف هەمەوەند »ی[٣٩] پیرەمێردن ، کە وێنەی فۆلکلۆرو ناوخەڵکی ئەم سەرگوزەشتانەی هێناوەو خامەی هونەری خۆیی بۆ خستوونەتەکار •

ئەو چەند ووشەیەی پیرەمێرد ــ کە لە ساڵی ١٩٣٥دا کردبوونی بەسەرەتای « دوانزە سوارەی مەریوان » باشترین قسەن بۆ ئەوساو ئێستای چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی • پیرەمێرد نووسیویە :

« منداڵ بووم ، هەرچەندە بەیتی دوانزەسوارەیان بۆ ئەکردم ، بەو منداڵی‌یە خۆم بە پاڵەوانێك دەزانی •

که داراغا ئەیگووت :

کوڕگەل فیدای هەڵمەتی شێرانەتان‌بم ، رۆژێکەو ئەمڕۆ رووی خاکەکەتان سپی‌کەن • منیش بە خەیاڵ‌خۆم‌ئەدایێ ، ئێجگار کە ئەیانخوێندەوە •

جوامێر ئاغای رەنگینە پڵنگی چنگ بەخوێنە

من ئەوەندەی‌تر شەیدای‌ئەبووم ، ئینجا زۆر ئاواتەخواز بووم ، کە بۆم هەڵکەوێ ئەم دوانزەسوارەیە بنووسمەوە ، بەڵام هیچ بەڵگەو بناغەیەکم دەست‌نەکەوت ، منیش راستەوڕەوان ، باوکم چۆن لە

باپیرمی بیستووەو منیش چۆن لە باوکم بیستووە وا نووسیمەوە ، وە ئەمەش راستیی‌کەیەتی •
ئۆف شاعیرەکانی پێشین ••• »[30]

## داســــــــتان

**بەرەتایەکی تیۆری :**

داستان ، یاخود « پۆیەم » ، یا « ئیپۆس » ، لە ئەدەبی جیهـــانداو لە مێژووی درێژی بەرەوپێش‌چوونی ئـــــەم ئەدەبەدا ، جێگەیەکی تایبەتیی هەیە • داستان لە ئەدەبی فۆلکلۆری گەلانداو لە ئـــەدەبی نووسراوەیاندا ، لە زۆر دیمەنو روخساردداو لە ناوەرۆکیشدا — زۆر بە ناو یەکدا چوو — ونو لە یەکتر ئەچن • ئەم راستی‌یە لە ئـــەدەبی فۆلکلۆرو نووسراوی کوردیشدا هەر وەك ئەوی گەلانی‌ترە •

« ئیپۆس » بە جۆرە ئەدەبێکی هونەرمەندانە ئەلێن ، کە کەرەسەی راستەوراستی — شتێکی مەوزوعی « ئۆبجەکتیف »ە ، راستی‌ی ژیان لە دەروونی خاوەن بەرهەمەکەوە ئەهێنێتەدەرەوە •

ئیپۆس ، بەرهەمێکی چیرۆك‌ئامێزە ، لە فۆرمی وێنـــــەدا ، باری ژیانو بوونی گەلو پێوەندیی کۆمەلایەتی‌و نەخشـــەی بەرەوپێش — چوونی مێژوویی دەرئەخا •

لە بەرهەمی داستانا ، هەر رووداو و باری ژیانی ئادەمیزاد بە تەنیا نی‌یە ، بەلکو ئاواتی ئادەمیزادیش ئەخرێتە بەرچاو • جیـــــاوازیی بنەرەتیی ئیپۆس لەگەل لیریك‌دا ئەوەیە کە کەرەسەی لیریك جیهـــانی ناو دەروونی ئادەمیزادە ، ئەو هەستانەیە کە لە ئەنجامی جــوجوولی ژیاندا دروست‌ئەبی‌و دەرئەپەرێ ، ئەویش وەك هۆنراوی داســتان ، مەبەسی ئەوەیە لە وێنەیەکدا نەخشەیەکی فراوانی ژیان بخاتە بەرچاو •

ئیپۆس ، لە رێرەوی گەشەسەندنیا مێژوویەکی درێژو دەولەمەندی هەیە • زۆر بەتین بەستراوە بە گەشەسەندنی گەلەوە • بۆیە ئەبێ لەوە

بگەین کەوا ئیپۆس کە لە خۆیدا رووداوێکی مێژوویی‌یە ، لای هەموو میللەتان چوون‌یەك پەرەناسێنێت . گەشەسەندنە فراوانەکەی داستانی یۆنانی کۆن شتێکی دیارە . ئەمڕۆش داستان لە ئـەدەبی ئەوروپادا جێگەو دەسەڵاتێکی گەورەی هەیە .

رۆژهەڵات هەمیشە خاوەنی لیریکی ڕەنگین‌بووە . بـەڵام لە زۆر وولاتی ڕۆژهەڵاتدا تا ئێستا لە مەیدانی ئەدەبی نووسراودا[٣١] دان بە داستاندا نەنراوە . وا سەرلەنوێ لە ئەدەبی نووسراودا داستان دێتەوە کایەوە . ئەمەش خاسیەتێکی تایبەتی‌ی داستان خۆیەتی . ئەوەتا وورده وورده ئەچێتە بەرگی پرۆڤێستەوە . وەك گۆرکی ئەڵێت ، داستان دوو ڕێگە ئەگرێت : دیالۆگو وەسف کردن . ئەمە داستان لە دراما جیائەکاتەوە ، چونکە دراما تەنیا « ووشەی پوختەکراو » بەکارئەهێنێ . لەگەڵ ئەوەشـدا ، « دیالۆگ »یش‌و وەسفیش هۆیەکن لە داستانا ، بۆ ئەوەی دیمەنی چیرۆك بدەن بەداستان . لەبەر ئەمەش کە دیالۆگی دراماکە دێتە داستانەوە تەنیا بە فۆرم‌ئەبێت‌و لەرێگەیەك بەولاوە بۆ گێڕانەوەی چیرۆك ، شتێکی تر نی‌یە .

گێڕانەوە لە ئێپۆسدا ــ بەر لە هەموشت ــ ڕاگەیاندنی سەرگوزەشتەیەکی ڕووداو یا شتی ڕاستەقینەی ئەوتۆیە کە بە جۆری ژیانەوە بەستراوە ، هەڵویست‌و پێوەندی‌ی نێوان کەسانی چیرۆکەکە هەمووی ئەبێتە « سوژێت » .

بیلینسکی ئەڵێ : سووژێتی داستان بەوە خۆی لە سوژێتی دراما جیاکردۆتەوە ، کەواله داستانا رووداو لە هەمووشت زیاتر دەسەڵاتی هەیە ؛ لە درامادا ئادەمیزاد .

لە ئیپۆسدا بوون‌و ژیان قارەمانە ؛ لە درامادا خۆیەتی‌ی مرۆڤ . ئەوەشمان لەبیرنەچێت کە لە توانادا هەیەو ئەشبێ داستان‌و دراما ئاڵوگۆڕێك لە نێوانیاندا ببێت‌و سوود لە گەشـەسەندنی سووژێتی

یەکتر ببینن •

دواشت ــ یەکێ لەو خاسیەتانەی سنوور بۆ داستان دائەنێ ئۆبجەکتیڤێتی‌ی داستان خۆیەتی ، ئەمە بە تەواوی ئیپۆس لە لیریك‌و تارادەیەك لە دراماش جیائەکاتەوە •

«ئیپۆس » کە بە یۆنانی مانای « ووشە »و « چیرۆك »ە لە ئەدەبی ڕۆژهەڵاتدا بە مانای داستان ، مەسنەوی ، بەیت ، چیرۆك •• هتد ، بەکاردێت • بەڵام هێشتا بە تەواوی سنوور بۆ مانای ئەم ووشانە دانەنراوە •• لە ئەدەبیاتناسی گەلێك دەوری جیاجیای مێژوودا ووشەی ئیپوس بە مانای پۆیەم‌و چیرۆکی مێژوویی‌و مەسنەوی‌و ئیپۆپیا بەکار ــ هێنراوە[٣٢] •

بیرڕوناکی مەزنی یۆنان ئەریستۆ لە کتێبی « هۆنراو‌ــ‌پۆیەتیکا »دا وەسفێکی پڕبەپڕی ئیپۆسی کردوەو هەوڵی‌داوە سروشت‌و خاسیەتەکانی دیاری بکات[٣٣] •

هیگڵ کە تەماشای ئیپۆسی ڕۆژهەڵاتی کردوە ، ووتویەتی ئەوەی لەو ئیپۆسەدا لەبەرچاوە ئۆبرەزی رەمزی‌و رووداوی ئەفسانەگەری‌یەکی وایە کە قارەمانی‌و ئازایەتی‌ی مرۆڤ پیشان ئەدەن[٣٤] • باسەکانی ناو داستانی ڕۆژهەڵات ، بە تایبەتی ئەوانەی لە سالآنی دوایی‌دا نووسراون ، ئەچنە ناو گیانی ئەم سەردەمەوەو بە ناو ناکۆکی‌ی نێوان بیری خۆیان ئەو بنکەی ژیانەدا تێ‌ئەپەڕن کە هەیە ، شاعیرئەگاتە ئەوەی کە ئەوکەرەسەی‌فۆلکلۆر یامێژووەی لەنووسیندا بەکاردێت ، ڕێگەی ئەوەی لێ‌ناگرێ کە کەم‌وکوڕیی ژیانی ئەمرۆ بخاتە بەرچاو ، نەخشەی ئەو دەورە بکێشێ کە تیایائەژی[٣٥] •

**داستانی هۆنراوە :**

بەرهەمێکی هۆنراوەی چیرۆك سروشتە • ئەم بەرهەمە پێی ئەووترێ « پۆیەمی ئیپۆس » و ئەبێ لە « پۆیەم ــ ملحمە »ی رۆمانتیکی جیابکرێتەوە • بنەڕەتی ئەم بابەتە سروشتە چیرۆکایەتی‌یە‌ــ

کەیەتی . بەڵام ئەرکی « لیریك » دەربڕینی هەستو نەستو باری دەروونەو لەگەڵ رووداو و سەرەنجامی قارەماندا ئەژی . هەندێ جار « پۆیەمی میللی » لە پۆیەمی داستان جیائەکرێتەوە ، چونکە ئەمیان ناوی خاوەنی دیارنی یەو پێی ئەووترێ « ئیپۆپیا » نەك ئیپۆس ، کە ئەویان خاوەنی ناسراوە . ئەم ناوە بۆیە دانەنراوە کە ئیپۆسیا بکات بە ژانرێکی تازەی ئەدەبی و لە ئیپۆسی جیابکاتەوە . بەڵکو تەنیا بۆ ئەوەیە کە داستانی میللی لەو داستانە جیابکرێتەوە کە خاوەنی دیارە .

پۆیەم ــ مێژوویەکی درێژی هەیە . سەرەتاکەی لە دەورانێکی زۆر کۆنەوە ، هەر لە کۆمەڵی خێلەکەیەوە دەست پێئەکات . وە لە دەوری کۆیلەیەتیدا گەشەی سەندو لە دەوری دەرەبەگیشدا هەر لە پەرەسەندنابوو .

پۆیەمی داستان لەم هەموو دەورانەدا ، لە کۆڕی ئەدەبیاتدا وەك ژانرێکی بە دیمەن جێگەی خۆی هەبووە .

لەم دواییەدا پۆیەم بەتەواوی بوو بە ژانرێکی تازە ، گەورەترین وێنەی رۆمانە ، وە لەم ڕێگەیەوە پۆیەم جێگا بە دیمەنەکەی خۆی لە کیس نەدا . وە هەر لەم کاتەدا پۆیەمی رۆمانتیکی لیریك زۆر گەشەی سەندو پەرەسەندنی ریالیزمی ڕەخنەگرانە بووە هۆی بەرزبوونەوەی پۆیەمی داستان ، بەڵام لەسەر بناغەیەکی تازە ، وەك لای « هاینە »و « نیکراسۆڤ » ئەبینرێ .

دەورەکانی مێژووی پۆیەمی بە دیمەن ، لەیەك جیان . بۆیە ئەبێ لەسەر بناغەیەکی پتەوی مێژوویی بۆ لێکۆڵینەوەی پۆیەم بچین . هەمووجار سنوور بۆ دیمەنی جەوهەری ، خاسیەتی نموونەیی یەك دانێین کە پێوەندیی بەم ژانرەوە هەبێتو بەسترابێت بە پێوەندیی کۆمەڵایەتی یەوە .

هەرچەند هەوڵی ئەوە دراێت کە سروشتی پۆیەم لە زروفی کۆمەڵایەتی جیابکرێتەوە ، ئەم هەوڵدانە سەری نەگرتوە .

پویەمی یۆنانی‌ی کۆن ــ وەك ئەوانەی هۆمیرۆس ، لـە بنەڕەتدا لە پۆیەمەکانی سەدەکانی ناوەڕاست ، وەك ئەوی « دانتی » جیـایە •
سەدەی تازەش مۆری تایبەتی‌ی خۆیی ناوە بە پۆیەمەوە بۆ ئـەوەی سروشتی پۆیەم باش بهێنینە بەرچاو ، پێویـستە با بە شـــێوەیەکی تێکراییش بێت ، دوای مێژووی گەشەسەندنی بکەوین‌و خاســیەتی جیاوازی هەموو دەورێکی دەست‌نیشان‌بکەین •
ئەبێ پۆیەم فۆرمێکی ئالۆزی هەبێت‌و لە گۆرانی‌ی داســتانی لیریکەوە سەری هەڵدابێ •
بە پیچەوانەی هونەری کۆنەوە ، پویەم لە پلـــەی یەکەمیـــدا وێنەیەکی بەرهەمی گەلە • لەبناغەدا ، پۆیەمی گەل گورانی‌یـــەکی میللی‌ی هێناوەتە بەرهەم ، کە گورانی بێژی میللی لەگەڵ گـۆرانی‌ی تازەی خۆیدا یەکی‌خستوە • بەم جۆرە پۆیەمی میللی ، ئـــەوەی بۆ ڕووداوێکی گەورە تەرخان‌کرابێت ، وەك ئاوێنەیەکی تایبـــەتی‌ی گۆرانیش تەماشائەکرێت •
پۆیەم لە دەورانی ڕژیمی خێلەکیدا ، لە کاتێکدا کە لــــە ژیانی کۆمەلایەتی‌یا چاکەی کۆمەلە خەلك قانزاج‌و بەرژەوندیی تاقەکـەسی ون‌ئەکردو گیانی کۆمەلایەتی لە هۆشی خەلکیدا جێگیربوو ، لـەو کاتەدا سەری دەرهانی •
ئەم ئاوێنەیە ، هەر ئاسایی وێنەی ئـــەو ڕووداوە گرنگـــانە پیشان‌ئەدات کە خەلکیان ئەهێنایە جونبوش • یا وێنەی ئەو کەسانەی تیابوو کە سوودیان بۆ گەل هەبوو ، وە بە کرداری گەورە جێگـــای بەرزیان بۆ خویان گرتوە • بەم جۆرە لە یۆنان « ئیلیـــادە » لــــە فەرەنسە « بەیتی‌ڕۆلاند » ، لای ئەلەمان « بـــەیتی نیبێلونگ » ، لای فارس « شانامە » لە هیندستان « مەهابەهارتە » و« رامەیانە»و لـــە ئیسپانیا « بەیتی سەید »و لە ناو ڕووسدا « ووشەیـــەك دەربارەی ئیگۆرۆف »و لە فینلەندە « کەلەڤالا » هاتەبەرهەم • کە پەیدابوونی

پۆیەم ئەبەستین بە فاکتەوە ، یا بە کەسانی مێژووەوە ، نابێ ئەوەمان لە بیر بچێتەوە کە پۆیەم تۆمارکردنێکی مێژوو نی یە • بەلکو بەرهەمێکی سەرزمانە ، پشتاوپشت ئەووترێتەوەو ئەمێنێتەوە • گۆرانی بێژی ، هەر پشتە هەندێکی لیٰ ئەگۆڕن و هەندێکی ئەخەنەسەر ، ئیتر چ لـە رووداوا بێت یا لە کەساندا • بەم جۆرە هەموو پۆیەمێکی میللی بـە هەر سەدەو تیرەیەکدا تێپەڕبوو بێت ، چەند رووداو و کەسی لـەگەڵ خۆیدا هەلگرتوە • وە ئەو شتانەشی هێشتۆتەوە کـە لە کـاتی دروستبوونی پۆیەمەکەدا هەبووە • بۆیە لەم جۆرە پۆیەمەدا دیمەنی تاقە کەسێك یا رووداوێك بە تەنیا نابینرێ ، بەلکو گەلێك کـەس و رووداو تێکەلٗ بە یەك بووــون •

نموونەی کلاسیکیی پویەمی داستان « ئیلیادە » و« ئۆدیسا »ی هۆمیرۆسە • لە رووی کاتەوە ، ئەم پویەمانە هەرەکۆنترین بەرهـەمی ئەمۆزارە ئەدەبی یەن • ئەم پۆیەمانە بەرهەمی سەدەی نۆیەم و هەشتەمی ( پیش • ز )ن • واتە ئەو کاتەی تازە لە یۆناندا جیاوازی کۆمەلایەتی و چینایەتی پەیدا بووبوو ، کە هێشتا رژێمی یۆنان لە خێلەکێتی یـەوە نزیك بوو • ئا لەو زەوی یەدا « ئیلیادە »و ئۆدیسا هاتنە بەرهەم • هەر لە رێگەی بەقوولی روانینە ئەو کۆمەلٗ و ژیانی کۆمەلایەتی یەوە کـە « ئیپوپیا »ی تیادابوو ، ئەتوانین لەو روخسارە مێژوویی یەوە بگەینـە ناوەرۆکی قارەمانی داستان و لەو شتە بگەین کە دووبارە نابێتەوە •

ئیپوپیا : لە ئەدەبی جیهاندا ، ئەمە بە داستانی هـۆنراوەی مێژوو ئەلێن • ئەمە بەرزترین فۆرمی هۆنراوی داستانە • وە زۆر لە زووەوە دان بەوەدا نراوە کە « ئیپۆپیا » تاجی سەری هونەری کلاسیکی یە •

ئیپۆپیا ـــ لە رووی ( گرێ )وە زۆر ئالۆزە • ئـــەو رووداوە گەورانەی مێژوو ، کە لە « ئیپۆپیا »دا دەرئەکـــەون ، لە رووەداوی مێژوویی سەربەخۆوە هاتوون و ئالۆز بوون ، بەلام ئالۆز بوونەکـــە ناگاتە ئەوەی کە « گرێ »ی داستانەکە بپچرێ و هۆنراوەکە ببێتـــە بەشێکی سەربەخۆ و یەکێتیی هونەرمەندانەی تیانەمێنێت •

هونەری هۆمیرۆس لەوەدایە کە توانیویەتی دەست بە رووداوێکی دراماتیکیەوە بگرێتو شتەکانیتر بەوەوە بەستێ • بۆ نموونە ــ لە « ئیلیادە »دا بە درێژیو تەواوی دەست ناداتە خـــــــتنەرووی دە سالەی ئابلۆقەدانو گرتنی شاری « ترا »ی ئاسیای ناوەراســـــت لەلایەن یۆنانیەکانەوە ــ بەڵکو توورەیی ئاخیلۆس گـــەورەترین تاوە ــ لە ناو پۆیەمەکەدا •

تاو ( لحظة ) یا ( لووتکەی گرێ )ی ناوەندیی هـــەڵبژاردەوەو زۆر لە سەرخۆو ئاسایی داستانەکەی بەستوە بە بەهانەی گـــەورەی هێرشەکەی یۆنانەوە ، بەوەوە کە پارس ( هێلانە )ی جـوان ئەدزێو بە کوشتنی ( پاترۆکڵ )و ( هیکتۆر )ەوە •

خاسیەتێکی « ئیـ[illegible]ا » لە هێواشکردنەوەی رووداودایـــــە • ئەبینین کەوا زۆرجار [illegible]ـیـپیا» کاتی وا هەیە کارەساتەکە لـــە جێیخۆیدا ئەگیرسێتەوە ، بـــــەڵام راگرتنی رووداو زروفێك لە چیرۆکدا پێكدێنێ کە باری سەرنجو ئوبجەکتیڤیتیی بـــەهێز بکات • لە ئیپۆپیادا رێرەوی رووداو و چیرۆلـو پەرەسەندنیان ، بێ ئـــەوەی نووسەر خۆی بچێتە کۆرەوە ، رێئەگرتەبەر • تەنانەت یەکـــــە بایەخدان بەم یا ئەو رووداو ناخرێتە فۆرمێکی ئاشکراوە ، بەڵکو لـــە رێگەی کەسانیترەوە دەرئەخرێ • وەك تێستۆرو خواکانی یۆنان لـــە « ئیلیادە »دا •

ئیپۆپیا سروشتێکی مەزنی هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە لە قسـەیەکی هێواشی رێکوپێکی ، لەسەرخۆداو لە ریزە ناوێکی لەگـــــەڵ یەکدا گونجاو و لە بەراوردێکدا دەرئەکەوێ •

رۆشنیو پوختەیی زمانو هەستکردنی تەواو ، ئـــــەوساش ئێستاش لەم بەرهەمەدا هەر بینراوەو ئەبینرێ • هۆمیرۆس زۆر بـــە رۆشنی باری هەموو ئەو کارو رووداوانە ئەخاتەرووکــــە بەسەر یەك بە یەکی قارەمانەکانیا دێن • ئەمــــــە زۆر بە ووردیو بە شێوەیەکی

ئاسایی • لەگەڵ وەسفی ناو دەروونو ئەو کەرەسانەدا یەکئەگرێت، کە دەوری ئادەمیزادیان‌داوە •

هۆمیرۆس زۆر ژیرانە هێزو ڕوناکیی ڕۆژ ئەخاتەڕوو ، جاروبار لە تاریکیی شەوی جیائەکاتەوە • زۆر بە ووردی توانیـویەتی وێنەی تیشکی ڕۆژو گەرداو و ئاگرو بریقەی شیرو ڕم نەخشە بکێشێ •

هەروەها پۆیەمی « مەهابەهارتا »و « رامایانا »ی هیندیش برێتین لە یادگارێکی کۆنی بەرهەمی داستان • پۆیەمی ( مەهابەهارتا ) لـــە سەدەی پێنجەمی ( پیش • ز )دا نووســراوە ، ( رامایانا ) چــــەند سەدەیەك پاش ئەوە • ئیپۆپیای هیندی لە دەورێکی‌تردا هاتۆتەکایەوە ، هەندێ شتی‌تازە هێنایە ناوەوە • هەندێ شتی جیا کــــە بە شوێنی خۆیەوە بەندەو هەندێ شەقلی ئاشکرای تاقەکـــــەسی تیایە • ئەم نموونەیەی ئیپۆسی هیندی ــ کەشتێکی گەورەیە لە کەڵچەری جیهانا، باری سەرنج ، لە دەروونی ئەو نەتەوە گـــەورەیەدا ، لە پلــــەیەکی مێژوودا دەرئەخا • پاش ئـــــەمانە ، گەورەترین دیمــــەن پۆیەمی « ئینییدا »ی ( ڤێرجێل )د • ئەم پۆیەمە لە سەدەی زێڕینی ئــەدەبیاتی لاتینی‌دا • واتە لە ساڵانی ٢٩ تا ١٩ی سەدەی یەکەمی ( پیش • ز )دا هاتۆتەکایەوە • « ئینییدا »وەك پۆیەمەکانی هۆمیـرۆس ، ڕووداوی گەورەی‌میللی ئەخاتەڕوو•ئەم ڕوخسارە لەداستانەکانی‌هۆمیرۆسی‌یەوە نزیك‌ئەخاتەوە ، بەڵام ئەم لە جەوهەردا لەو نموونە کلاسیکی‌یـــــە جیایە • چونکە ئەم مەبەسی ئەوە نی‌یە وەك هۆمیرۆس میللەت بــــە بەرزبگرێ ، بەڵکو مەبەسی گەورەکردنی « ئاگستۆســــە » • ئەوەش هەر لە خۆیەوە نەهاتوە کە قارەمانی گەورەی « ئینییدا » بـــــە پیری گەورەی ئیمپراتۆرەکان ئەزانرێ •

لێرەدا ئەم پەیڕەوە ڕەگەزێکی میتۆلۆژی یا بڵێین ئەفسانەیی هەیەو مەرجی مەراسیمی ئاینی بەجێ‌هێنانی بۆ دروست‌بووە •

قارەمانانی « ئینییدا » هیچ مەبەستێکیان لانی‌یەو گیــــانیان

ئازادنی‌یەو بە جۆرێکی تێگیتیڤی‌و ڕەش‌بین ئەڕوانە دوارۆژ • ئەمە هێزو ڕۆشنی‌یان لە ناو ئەدات •

ئەو زمانەی داستانەکەی « ڤێرجێل »ی پێ‌نووسراوە ، سروشتی بەرزو جوانی هونەرمەندانەی ووشەکاری تیایە • وە لەگەڵ ئەمانەشدا « ئینیدا » هەر بە بەرهەمێکی ڕەنگینی میللی دائەنرێ ، چونکە بە نەخشەو تابلۆی ڕۆشن ، وێنەی سەدەی خۆی‌و پێوەندیی ناوخەڵکی ئەو سەردەمە دەرئەخات • بۆیە بە یادگارێکی بە نرخی ئەدەبیش دائەنرێ •

هۆی جیاوازی سروشتی ئینیدا لەگەڵ داستانەکەی هۆمیرۆسدا ئەوەیە کە پێشکەوتن لەو داستانەدا بەلای شتی تاقەکەسی (شخصی)دا ئەچێت‌و لە زروفی کۆمەلایەتی دائەبڕێ‌و نائچێتە ناو ئەو گۆڕانە بەتینەوە کە لە دەوری ساوایەتی‌ی مرۆڤایەتی‌دا بەسەر بیری مرۆڤدا هاتوە • لەم سەدانەی دواییشدا هەولی داستان دانان دراوە ، بەلام سەری نەگرتوەو هەر ئەبوو واش‌بێت • چونکە داستانی یۆنانی سەردەمی ساوایەتی‌ی مرۆڤایەتی‌ی نەخشەکێشاو بەسەرچوو •

مێژوو لەم دوایی‌یەدا هەندێ مەسەلەی هێنایەگۆڕەوە کە پێویستیان بە فۆرمەکەی داستان هەبوو ، بۆیە داستانی وا هەبە بەرهەم کە داستانەکانی هۆمیرۆسیان کردبووە نموونە ( وەك داستانە کلاسیکی‌یەکان ) • بەلام ئەمانە هەر بە تەواوی جۆرە داستانێکی‌تر بوون • وە هەر چەندە لەم دوایی‌یەدا جۆرەها داستانی جیاجیا پەیدابوو ، بەلام ئەم تازانە بە جۆری داستانە کۆنەکانی یۆنان پەسندنەکراون • چونکە ئەو شێوە میللی یەو ئەو قوولی‌و ڕاستی‌ی ڕووداوەی تیانی‌یە • ئەم دیمەن‌و ڕوخسارانەی داستانی میللی لەم دەورەدا شێوەی مێژوویی دارشتنی خۆی لە چوارچێوەی ڕومانی دیمەن داستانیدا دیوەتەوە • بۆیە « شەڕو ئاشتی »ی تەلستۆی لەگەڵ داستانەکانی هۆمیرۆسدا بەراورد ئەکرێت • ئێستا نموونەی ئەو

داستانە کلاسیکی‌یە بە تەواوی لـــە ڕۆمانی ئەدەبی ریالیزمی تازەدا بەرهەم دێت •

یۆنانی کۆن‌و ڕۆژهەلاتیش گەلێك بەرهەمی داستانیان بووە کـە هەندێکی سروشتی فەلسەفی‌ی هەیە ، هەندیکیـــان بە ووردی ژیری (حیکمەت)ی دەربڕیوەو هەندێ جۆریان وردە وردە ئەچنەوە سـەر ئەفسانە[٣٦] •

ئەم باسە تیوری‌یەی سەرەوە هەرچەندە زۆرتر بەســـەر ئەدەبی نووسراودا دێتەدی ، بەلام لەوەدا کــە کۆن‌و بەستراون بە سروشتی گەلەوە ، زۆر لە فۆلکلۆر جیاناکرێنەوە • هەروەها ناتوانین بلێین لــە کوردیدا ــ شتی وەك بەشە نووسراوەکەی یۆنان‌و ڕۆمانمان هەیە ــ هەروەك زوربەی گەلانی سەرزەمینش لەو بابەتەیان نی‌یە ، بــەلام لە فۆلکلۆری کوردیدا گەلێك پۆیـــــەم‌و ئیپۆپیا هەیە کە شـــەقلە گشتی‌یەکانی داستانی جیهانی‌و داستانی فۆلکلۆریان تیا بەدی ئەکرێ‌و شەقلی تایبەتی‌ی فۆلکلۆرو بەرهەمی ناو کوردەواریشیان تیــادیارە • هەروەك « سەرچاوەی شیعری کوردی » هەر بەرهەمی میللی‌یە ، ئــەم سەرچاوەیە هۆی ئازایـــەتی‌و مەردایــــەتی ئەرژێنێتە داســـتانی قارەمانێتی‌یەوە •

## داستانی کوردی‌و جــۆرەکانی

سەرەتای ڕێ‌رەوی گەشەسەندنی ژانری پۆیەم ــ لە بەرهــەمی خەلکدا ، لە یادگارە نووسراوەکانی زوودا ، پاشماوە دەولەمەندەکەی بەرهەمی سەرزمانی ناو میللەت ، ئەو هەموو داستانــــەی‌لە سنگی خەلکدا پارێزراوە ، هەروەها ئەو ئەسەرانەی نووسراونەتـــەوە ، ئەمانە هەموو بناغەیەکی زێڕینن بۆ گەنجینەی ئەدەبیاتی کوردی •

سەرچاوەی باسەکانی ، وەك لای هەموو گـــەلانی‌تر ، وا لە

بەرهەمی سەرزمانی میللەت ، لە ( فۆلکلۆر )دا ، بەتایبەتی لە داستانی خەیاڵیی کۆنو لە ئەفسانەدا •

داستانی کوردی ، هەرچەندە لە دیمەنو سیمای گشتیی‌دا لەو داستانانە ئەچێت کە لە فۆلکلۆرو ئەدەبی نووسراوی گەلانی‌تردا هەیە ، بەڵام ڕێڕەوی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ڕێبازی تایبەتیی بەرەوپێش‌چوونی ئەدەبی کوردی خۆی(بە فۆلکلۆرو نووسراوی‌یەوە) هەندێ شەقڵ‌و دابەش‌کردنی لە جۆرو ناو دیمەنی داستانی کوردیدا دروست‌کردوە کە تایبەتی بە خۆیەتی •

لەسەر بناغەی ئەم ئەنجامە ئەتوانین داستانی کوردی بکەین بە دوو بەشی بنەڕەتی‌یەوە :

١ ـ داستانی قارەمانێتی •

٢ ـ داستانی دلداری‌و ئەڤین •

داستانی قارەمانێتی ئەکرێ بە چەند بەشێکەوە ، یەکەمیان ـ ئەو داستانەیەکە وێنەو دیمەنێکی خەیاڵی تیایە یا کۆڵەکەی باسەکەش ئازایی‌و قارەمانێتی بێت • ئەم داستانانە زۆرتر لە حیکایەتەکانی شانامەی فیردەوسی ئەچن ، کە لە کۆڕی داستانی قارەمانێتی‌و لە کۆڕی ئەدەبی فارسیدا ناوبانگی لە سنوور بەدەرە •

بەڵام ئایا ئەم داستانانەی فۆلکلۆری کوردی هەر تەواو ئەوەی شانامەیە یا شتێکی ترە ؟

گەر لە ناوی ئەم داستانانە بگەڕێین ، ئەوا ناوی وەك داستانی « ڕۆستەم » ، « ڕۆستەم‌بەگ » ، « ڕۆستەم‌و زۆراب » ئەبینین[٣٧] • وا دیارە تائێستا تێکستی فۆلکلۆری ئەم جۆرە داستانانە لە کوردیدا چاپ نەکراوە ، وە چەند هۆنراوەیەك کە بەم ناوانەوە چاپ‌کراون ، وەرگێرانی فارسیی شانامەن •

بەڵام گەر داستانی ڕۆستەم‌و قارەمانانی تری حیکایەت لە ڕۆژهەڵاتدا بڵاوبێت ، بۆچ ئەبێ بەشی کوردیشی پێوە نەبێت ؟

رەنگە زۆر لە خوێنەران ئەوەیان لە بیر بیت کە لە سالانی کۆندا ، بـە تایبەتی شەوانی رەمەزان ، لە ( قاوەخانە ) گـــەورەکانی شـــارانی کوردەواریدا حیکایەتخوان ، چیرۆکی روســـتەمی زالو زۆرابو قارەمانانی تری بۆ خەلك ئەخوێندەوەو لە دەورێکی کۆتردا خەلکەکە هەموو هۆشو گۆشیان ئەدایە کارەساتو رووداوی حیکایـەتەکە . بەلکو بە جۆرێك لەگەلیا تێکەل ئەبوون کە هەر کـەسە قارەمانێکی لەو حیکایەتە بۆ خۆی هەلئەبژاردو لە زنجیرەی ئەو حیکایەتەدا کـــە هەموو شەوانی رەمەزانی ئەخایاند ، هەمیشە هیوای ســـەرکەوتنی قارەمانەکەی خۆیی بوو . تەنانەت لە کاتی حیکـــایەتخوێندنەوەدا دەستەی هـــەر قارەمانە لە کونجێکی قاوەخانەکـــەدا لای یەکەوە دائەنیشتنو وەك ئاگاداری شەڕی ڕاستەقینەی نێوان ئەو قارەمانانـە بن ، بە دەستو بە دەم پشتی قارەمانی خـــۆیان ئەگرتو لەگـــەل وێرکەوتنیا ماتەم دای ئەگرتن[٣٨] .

ئەو حیکایەتانە لە رووی داڕشتنو فۆڕمەوە هەر وەك ئـەو بەیتی کوردییە وا بوون کە ئێستا لە کایەدان . واتە حیکایەتخوان بـــە قسە ــ یا بلێین بە نووسینی پەخشان ــ رووداوی ناو چـــیرۆکەکەی ئەگێڕایەوەو لە هەندێ شوێندا بە ئاوازەوە دەنگی لێ هـــەلئەبڕیو دواندنەکەی بە شیعرو گۆرانییەوە ئەگێڕایەوە .

هەندێ کەس ئەوەیان لەبیرە کە ئەو حیکایـــەتانە فارسی بوونو هەندێ کەس ــ تاك تاك ــ بەیتی کوردیی ئـــەو داستانانەیان لـــە بیرماوە . لای هەندێك وایە کە ئەمە وەرگێڕانێکی کتوپڕیو لـــە جێگەی خۆیدای « شانامە »بوون ، یا هەر وەرگێڕانێکی نووســـراوی شانامە هەبوە ✻

دووەم ــ جۆری داستانی قارەمانێتیی کوردی ئەوەیە کە تەنیـــا پەردەی قارەمانێتیو ئازایەتییەك ئەگێڕێتەوە . زۆر جار داستانەکـــە دروستکراوە ، بەلام شتی بە ئەقلدا نەهاتوو و لـــە باوەڕو توانای

ئادەمیزاد بەدەری وەك داستانەكانی شانامەی تیا نییە • زۆر جاریش قارەمانی داستان كەسانی ڕاستەقینەن ، بەڵام جیاوازیی ئەم جـــۆرە داستانە لەگەڵ داستانی مێژوویی‌دا ئەوەیە ، كە ئازایەتی لـــەم جۆرە داستانەدا بە مەسەلەیەكەوە نەبەستراوە ، واتە هەر كەسێك لـە كۆڕی ژیاندا بە قارەمان ناوی دەركردبێ‌و ئازایەتی‌یـــەكی نواندبێ ئەوا ڕووداوی ئەو ئازایەتی‌یەی لە ناو كـــوردەواریدا داستانەو خـــەڵك ئەیگێڕنەوە • ئەمە لە ناوەرۆكدا هەستی خەڵك بەرامبەر بـــە ئازایەتی پیشان‌ئەدات‌و ئەوە دەرئەخا كە گەلی ئێمە پیاوی ئازای زۆر خـــۆش ئەوێت •

ڕەنگە ئازایەتی‌ی ناو ئەم داستانانە لە ناوەڕۆكی كۆمــــەڵایەتی بەدەر نەبێ • بەڵام ئەوەیە كە لەناو دێڕی داستانەكە خۆیدا ئەبی بـــە زەحمەت بۆی بگەڕێیت • لەم كۆڕەدا ئەتوانین ناوی دەیان ـــ داستان بنووسین : وەك بەیتی شـەریف هەمەوەند ، بەشاری‌چـــــەتۆ و ئەمی گۆزێ ، عەزیزو تەكش ••• هتد •

لەم داستانانەدا تەواو وێنەی قارەمان‌و بەبەرگی‌ی پیشان ئەدرێت• « سوارۆ » خۆی قارەمانی داستانی ( سوارۆ )یە ، لە داستانەكـــەدا تەواو وێنەی نەبەردیی ئەو پیشان ئەدرێت :

**سوار مەزنی ، بە منی مەزنی**
**سەرت لە پۆلای چنگت لە ئاسنی**
**هەر قەلاتەكی دەچی‌ئی ئەتوی لە بنی**
**هەر حاكمێكی زەڕەندەیە ئەتوی لە كنی**
**شا لەسەر تەختی ئەولایە لەبەر سامی تۆ ئاسەكنی**
**سوار ئەمن ئەوی ڕۆژێم پێ جوانبووی**
**دەستت دەدا شیریكی فەنەر(٣٩)**

داستانی قارەمانی‌ی كـــورد ، كەرەسەیەكی دەولـــەمەندە بۆ ووردبوونەوە لە گەلێك ڕووی ژیان‌و ئێستاو ڕابوردووی كـــورد • لێرەشدا زۆر بە ڕۆشنی كەرەسەی خووڕەوشت‌و ســروشتی كوردان

ئەبینین • ئەم داستانانە هۆیەکن بۆ جێگیرکردنی مێـــژوو و تەختو بەختو ڕابوردوو :

لەوی دەورم دەتۆڕی
لەوی زەمانم دەتۆڕی
لە دەوری ( قوبادخان )م دەتۆڕیری
لە دەوری شاهی ئەنەوشیرواتم دەتۆڕی
هەتا ئەوی زەمانی
هەتا دەوری قوبادخانی
هەتا دەوری شاهی ئەنەوشیروانی
هەتا دەوری جومجومە سولتانی
یەکێکم نەدیت وەکو سولەیمان بەگی میری هەریری
لە دیوانی پیسەرۆمیان هەڵبستێ بە گرانی
ئەوڕۆکە سەری من دەیشێ
دلی لەشکری ئاریانی قەت هێدی نابێ
لەبەرگریانو لەبەر ئەوان هوردە گلەیییان
ئەگەر ڕۆژم لێهەڵهاتبا لە هەموو قەدەمو حەوشاران
دەداتن لەسەری هەریرو هەریریەگیان[٤٠]

وەك ئەبینین داستانی قارەمانێتیی کوردی ووردە ووردە لــــە خەیاڵــــەوە بەرەو شتی ڕاستەقینەمان ئــــەبات • لە ئازایــــەتیو قارەمانێتییەکی سادەو تەنیاوە بۆ قارەمانێتیی مەبــەسدارو لاپەڕەی مێژوو • لێرەدا بەشی سێیەمی داستانی قارەمانێتیی کوردی دێتــــە پێشەوە • کە هەرچەندە لەسەر گەنجینەی فۆلکلور ئەژمێررێ ، بەلام لە زۆریانا دیمەنی تەواوی « ئیپۆسیا » هەیە • وێنەی تەواوی ڕووداو لە رووی مێژووەوە ئەگێڕێتەوە ، تابلۆیەکی مێژووی ئەو سەردەمــــە ئەخاتە پێش چاو •

داستانی « شەریف هەمەوەند » ، هەر وەك وێنــەیەکی قارەمانیو پەردەیەکی ڕەنگینی کارەساتیش ئەگێڕێتەوەو شەڕێکیش ئەخاتە روو کە برا برای تیا ئەکوشت ، هەروەها لاپەڕەیەکیشە لە مێژووی کورد :

قەلغانی زەردەماین چۆن دێنێ

**دەوری قەسەری با دەوێشەکێنێ**
**شەریف ئەکوژن لاوی ئەرمێنێ**
**قەلغانی زەردە مایێنی شێڕیە**
**دەنگی تەپلیان دێ لە مێرەدێیە**
**شەریفی ئەکوژن دۆستی چاولێیە**
**دەوری سلیمانیم پڕ شیوو پردە جارچی جاریاندا لەشکرمان گردە**
**دەڵێن سلیمانی حاکمەکەی کوردە**(٤١)

ئاشکرایە کە ئەم بەیتە شەڕی شەریف هەمەوەند ئەگێڕێتـــەوە لەگەڵ بابانەکانا ، چونکە شەریف داوای میراتی مێرێتیی ئەکرد :

**یاخوا سەربازان پەنجەیان بشــکێ گولێکیان دابوو لــە گۆی مەمکێ**
**لە جێی ئەو گوللەی زووخـــاو دەتکێ**
**قەلغــانی زەردەمایێنی بالەبان دەنگی تەپلیاندێ لە گردی سەیوان**
**هاوار وە گەرێ تالان وە گەرێ پاش شەریفی کەس با نەکا شەڕێ**(٤٢)

ئەم وێنەی قارەمانە ، ئازا ، کوڵنەدەرە ، مەردە ، لە هەموو بەیتە کوردییەکانا هەیە . هەر بەیتە نەخشەی چەند گۆشــــەو سووچی قارەمانی داستان ئەکێشێت . هەر وەك لە پاڵ ئەوەشدا دیمەنی چەپەڵی « قارەمانی نێگێتیڤ » یش نیشان ئەدات .

لە بەیتی خانزادو لەشکریدا ، چیرۆكخوان پاش ، ئەوەی تـــەواو سەرگوزەشتەی خانزادو لەشکری ئـــەگێڕێتەوە ، ئەوسا دیمـــەنە ترسناکەکەی ئەو کارەساتەو ئەنجامی ناپاکیی لەشکریو لە ناوچوونی تەختی خانزادو میر سلیمان بەگ ئەخاتە روو .

**( « قورتی مام لەشکری » ، بان بێبزاوان ، ( زەویی چـل پشکێ ) ، لە باشووری قەتمێ لە زەوییەکە بە کوچکو کەلەك ، لـــە بارەکی تۆزو گەردیان وەردەدا .**

**هاوار تە لە من ، لە پاشی ئەو ئاغا سولەیمان بەگی کوو بە قنجانەکی ژەهری دەست لە دنیایی بەردەدا )**(٤٣)

پاشان چیرۆكخوان دێتە سەر تابلۆی سەرەنجامەکەو ئەڵێ :

**سەری من دێشێ ، دڵی لەشکری ئاریانم چەندێ بەژانە ، دەچوومە ئەو هۆدەو دیوەخانەی ئاغا سولەیمان بەگی سەراسەر لێی پاخراتە .**

**دەچووە هۆدەی خولامان شیری ( بەنۆیی ) بە داری وە دەکرانە .**
**رمی ( نەسیری) سەر سینگۆلان درێژکرانە ، دەچووە تەویلـــەو تەویلەخانە .**

**چەند بۆرەی خاڵ خاڵ کەویتی قاپڕەش**
**شێی ئارەبستانی ناوەناو تێك ئێخرانە(٤٤)**

پاش ئەمە لە رووی لاپەڕەی مێژوو و وولاتی میرەوە پەردەیەکمان پیشانئەدات و ئەڵێت :

**قۆڵێکم هەڵئەدا لە بۆ ( قەمچووغە )ی موبارەك قۆڵی دیکەیان لـــە بۆ شەنەغەو گەزوەشانە .**
**قۆڵی دیکەم هەڵئەدا لـــە بۆ زێی زەماوی هی دیکـــەیان لە بۆ سەقزو بانە .**

**قۆڵی دیکەم هەڵئەدا لە بۆ سلیمانی مەملەکەتی کوردستانە**
**قۆڵی دیکەم هەڵئەدا لە بۆ شنۆیێ ، مەملەکەتی جانە**
**حەیفەو سەد مەخابنێ دنیایی**
**لە پاشی ئەو ئاغا سولەیمانبەگی**
**تاژیو توولە ئەگەڕێن بە بێ خودانە(٤٥)**

وێنەی قارەمان لە داستانی کوردیدا زیندووە ، لە جێگەی خۆیدا نەمەیی‌وە ، بەڵکو لە بزوتنەوەو بەرەوپێشچـــوونو پەرەسەندنو گەیشتنە پڕی دایە .

هەر لە داستانەکەی « سوارۆ »دا ئەم جۆرە وێنەیە دیارەو ئـــەو چەند دێرەی سەروو دیمەنی ئەوەن .

ئەم داستانانە بە وێنەی تاقە قارەمانێکەوە ناوەستن ، بــــەڵکو تابلۆیەکی تەواوی مەیدانی جەنگیش ئەخەنەڕوو ، ئەوە دەرئەخەن کە قارەمان لە سوپاکەی دانەبڕاوە بەڵکو ژیانو سەرکەوتنی هەر بـــە گەلەوە بەستراوە .

**لەشکرێك هەڵستاوە لەشکری (شام)و (شیرازان)**
**پێشی دەشتە سەر عەسکەران دوایی رادەوەستا ،**
**لەسەرچۆمی (کافوور)و ئارازان ...**
**دەپەڕیەوە بە حوکمی کەڵەکو گەمیان**

**کیژ دەڵێ دەستی منوودامێن بێ زینان بەرنەکێ**
**سەراچان شێران بەرنەکێ شێرگەران ...**
**تفەنگان بەربەسەر چەخماخ‌سازان[٤٦] .**

ئەم دیمەنە لە داستانی « عەزیزو تـــەکش » یشدا بە جـــوانی بەدی‌ئەکرێ ، لەشکری « مەنمی » لەو داستانەدا گەورەو بێ‌سنوورەو هەرگیز لە بن نایەت :

**سوارەل مەنمی سەفبوون وەجەم سەر عەزیزدەرکەن لە لەشکرەجەم**
**عەزیز وە لاکەل، تەکش وە هەفتیر ها وەختە بیو جەسەن خو نە شوێر**
**مایێنەکەی تەکش لە وەستان نایێ لەشکەری مەنمی هیچ دوایی نایێ[٤٧]**

ئەم داستانانە لە وێنەیەکدا تەواو قارەمان ئەبەستن بـــــە خاکی نیشتمانەوە . لە داستانێکی یۆنانیدا قارەمانەکـــــــە ( ئانتێ )کوڕی زەمینە ، کەس زەفەری پێ‌نەئەبرد ، چونکە پێی تەواو بە زەمینـــــــا داکووتابوو ، گەرمی‌و گوڕو ئازایەتی‌ی لە زەمینەوە وەرئەگرت ، تـــا پالەوانێك ( هیرکولیس ) پەیی بەم نهێنی‌یە بردو هات یەکســـەر پێی قارەمانەکەی لە زەمین بڕی . بەوجۆرە دی بــــــە زەویدا‌و زەفەری پێ‌برد (*) .

داستانی کوردی ئەم ڕاستی‌یەی لە شێوەیەکی جوان‌و ســــاکاردا داڕشتوە . خۆشەویستی‌ی نیشتمان‌و جوانی‌ی سروشتی وولاتیش لە پاڵ قارەمان بە نیشتمانەوە بەستندا دەرئەخات .

قارەمان بریندار ئەبێت ، چارەسەرکەری تەنیا سروشتی خاکەکەی خۆیەتی :

**کیژ دەڵێ : دەستی منوو بەدامێن بێ**
**لە بۆم بلێن بەوان حەکیمان**
**شتاقە دەستانی نەکەنێ**
**ئەبخۆم مەلحەمێکی لە بۆ دەگرمەوە**
**لە حێلی ، لە دارچینی ، لە قەنەفلی ، لە وردەگوڵی ،**
**لە تۆزی شەدی ، لە ژەنگی گواری ،**
**لە ئاروقی دەبەر گەردەنی !!..**

**دەیهاویمە سەر برینی دەوی برینداری**
**نە بادا لە منی سەرشینی بێنیتەوە تەشەنی**[٤٨]



گەورەترین « ئیپۆس »ی کوردی ، بە تایبەتی ئەوەی کەرەسەی مێژوویی و فۆلکلۆری تەواو دەربارەی مابێت ئەوە بەیتی « قەڵای دمدم »ە ، کە لەناو خەڵکدا بە « دمدم »یش و بە بەیتی « خانی دەست زێرین »یش ناوبانگی هەیە .

ئەم ئیپۆسە خەباتی ساڵانی ١٦٠٨ — ١٦١٠ی کوردان ئەگێڕێتەوە بە سەرکردایەتیی ئەمیرخانی یەکدەست ، رووبەرووی شا عەباسی یەکەم . مێژوو ناسانی کورد لە رووی گێڕانەوەی رووداوی مێژووەوە زۆریان لە بارەی ئەم لاپەڕە ڕەنگینەوە گێڕاوەتەوە . بەڵام فۆلکلۆری کوردی دیمەنێکی هونەرمەندانەی ئەو ئازایی و نەبەردییە ئەگێڕێتەوە .

ئۆسکارمان ، لە ساڵی ١٩٠٦دا تێکستێکی کرمانجیی خوارووی (سۆرانی)ی ئەم داستانەی چاپکردوە[٤٩] . هەروەك (ژابا)و (پریم)و (سۆتسین) یش بە شێوەی کرمانجیی ژووروو چاپیان کردوە . دوکتۆر ئۆردیخانی جاسمی جەلیل ئەم تێکستانەی لەگەڵ چەند دەستنووسێکی تردا پێکەوە چاپ کردوەو کردوویە بە رووسی[٥٠] . هەروەك نۆتی مۆسیقای ئاوازی بەیتەکەی دمدم لەلایەن جەمیلەی جاسمی جەلیلەوە نووسراوەتەوە[٥١] .

دوکتۆر ئۆردیخان جەلیل پاش ئەوەی لە ٦٢لاپەڕەدا ، بە رووسی لەم داستانەی کۆڵیوەتەوە دێتە سەرئەنجامو ئەڵێ :

( داستانی قارەمانێتیی کوردی « خانی پەڵ زێرین » — کە بەرهەمی فراوانترین کۆمەلانی خەڵکە ، بە پەیکەری خەباتی مەردانەی کوردان ئەژمێرری بەرامبەر بە کۆیلەیێتیی شاکانی ئێران . لەم ئیپۆسەدا کەرەسەی ڕاستەقینەی تەواومان بۆ لێکۆڵینەوەی باری سەرنجی

کۆمەڵایەتیو سیاسی ی گەلی کورد ، لە کۆتایی سەدەی شانزەهەمو سەرەتای سەدەی حەڤدەیەمدا دەست ئەکەویت • ئەم داستانە وەك ئاوێنەیەکی ئایدیا ( بیرو ) و هونەر رووئەکاتە سنووری ئەو رووداوانەی لە قەڵای دمدمدا بەسەر ئەچن • گەل سروودی ئەو جەنگانە ئەڵێ ، خەبات بۆ ئازادبوونو سەربەخۆبوون هەموو کوردستانی گرتبۆوە • ئەمە یەکێکە لەو دیمەنانەی لە بنەڕەتەوە ئێپۆسی « خانی پەڵزێڕین » لە گۆرانی ی مێژوویی جیائەکاتەوە • ئەم داستانە هەموو خاسیەتو دیمەنی تایبەتی ی ئێپۆسی قارەمانێتی ی هەیە ، ئاوێنەی خەباتی گەلە لە پێناوی پێکەوەنانی فەرمانڕەوایی مەرکەزیدا ، بۆیە بایەخێکی تەواوی لە لێکۆڵینەوەی پێوەندیی نێوان فۆلکلۆرو واقیعداو نێوان مێژوو و رووداودا هەیە •

ئێپۆسی « خانی پەل زێڕین » نەخشەی خەباتی گەل بەرامبەر بە دەرەبەگی زۆردار ئەکێشی ، سەرقارەمانی بە ناوی گەلی زەحمەتکێشەوە ئەدوێ • هەموو کلۆلان بانگ ئەکات تا رووبەرووی دەستداران راپەڕن ، کەلوپەلیان کۆبکەنەوەو ڕووبکەنە قەڵای دمدم ، دوور لە دەسەڵاتی زۆرداران ، لە دوژمنی دەرەوەو ناوخۆ گەل بە دوای ریبازێکدا ئەگەڕێ کە لە باری سەختی ڕزگاری بکات ، بەڵام لە ڕێگەی نەرمیو رەحمی دەسەڵاتدارانەوە نا ، بەڵکو بە خەباتی چەکدار ڕووبەڕوویان • ئەمە یەکێکە لە بیرەکانی ئێپۆسەکە ، کە بناغەشێتی •

چیرۆکی خانی پەل زێڕین زۆر بەپەرۆشەوە لە یادی گەلدا ماوەتەوەو پارێزراوە ، پشتاوپشتو لەم دەم بۆ ئەو دەم بە یەکتر سپێرراوە • پتر لەمە ، لەم سێ سەدەیەی بوونی یا ، داستانەکە دیمەنی گۆرانی هۆنەریی خۆی تەواو دیوەو بووە بە ڕەگەزو ئەفسانەو چیرۆکی خەیاڵ •

لەگەڵ ئەمەشدا ، وەك لە ناوەڕۆکدا دیارە ، « خانی پەل زێڕین »

چیرۆکێکی مێژوویی پلەی دەرەبەگایەتییە • هەر لە خۆیشیەوە نییە کە ئەم بەرهەمە رووداوی ڕاستەقینە پیشان ئەدا • ئەمە هەر لێرەدا نییە ، بەڵکو لە گەلێك چیرۆکی قارەمانێتیی گەلانی ئاسیای ناوەڕاست و پشت قەفقاسدا هەیە ، کە بە پلەی پێوەندیی دەرەبەگیدا تێپەڕ بووبوون • )[٥٢] •

بێ گومان ، بەیتی قەڵای دمدم گەلێك وێنەی ڕاستەقینەی خەباتی گەل و گەلێك وێنەی قارەمانی ڕاستەقینەی تیایەو لە ناو دێڕ بە دێڕی داستانەکەدا دەنگی گەل ڕوو بە ڕووی دوژمنانی ، بە زمان ئەم یا ئەو قارەمانەوە هاوار ئەکات •

دوا وەڵامی ئەمیر خانی پەڵ زێڕین کە سەرکردەی کوردان بووە ، هاواری مەردانەیەتی بەرامبەر بە شاعەباس :

خەلقی مە نایێ ڕایێ
هێڤیا (x) دژمنە لە مەیدانێ
مینا (x x) شێرا ئەو شەڕدکە
هەرتم ، (x x x) دژمنا لەت دکە
مە نە خوفێ ئەسکەرێ تە
مە نە خوفێ خانێ تەوریزێ
کەلێ ڕانەکا ژ هەمبێزێ
مە نە ترس خانێ چین مەچینێ
قر ناکە خەلقێ مە
مە نە خوفێ خانێ تەیمووریا
بەلا ناکە خەلقێ مە لە چیا
تاجێ تە قبوول ناکەم
کوردستانێ بێ ئاڤ[٥٣] ناکەم[٥٤]

داستانی قارەمانیی کوردی زوڵم و زۆر تاوانبار ئەکات ، دوو ڕشتەی خەباتی کوردان ئەگێڕێتەوە ، خەبات بەرامبەر زۆردارانی خۆماڵی و خەبات لەگەڵ بێگانەی دوژمنا • لە داستانی « گۆزێ و بەشاری چەتۆ »دا ئەبینین « گۆزێ » ، کە قارەمانی داستانەکەیە ،

کوڕی گەلە، بەشاری دەرەبەگ بە یارمەتی‌ی بێگانــە نەیتێ ناتوانێ سەر بە قارەمانی ئەو داستانە شۆڕ بکات(٥٥) ٠

هەرچەندە ئەم داستانەو گەلێکی‌تر قارەمانەکانی لە ریزی خەلکەوە هاتوونەتە دەرەوە ، بەلام زۆر داستانی مێژوویی کوردیش هــــەیە کە قارەمانەکەی یا میرە یا ئاغایە ٠ ئەمەش وا ناگەێنێ کــــە داستانی کوردی ئەدەبی میران‌و ئاغایانە ٠ بەلکو ئەمانە ئاوێنەیــەکی مێژووی نەتەوەن ، وەك ئەزانین لە سەدەکانی ڕابوردوودا رۆم‌و عــــەجەم لەم خاکەدا هاتوبردەیان بووە ، میرەکانی وولات پێش خەلکەکە کەوتوون‌و وەك بەندێك بەرامبەریان وەستاون ٠ بۆیە لاپەڕەی ئەم جوامێرێتی‌یە لە فۆلکلۆرو ئەدەبی میللی‌و ئەدەبی کلاسیکیماندا ماوەتەوە ٠ لەگەل ئەمەشدا هەر لەم داستانە کوردیانەدا رۆلی خەلکی لە بیرنــــەکراوە ، خەلك سووتەمەنی‌ی هەموو کارەساتێکن ، بۆیە لەم داستانانەدا لـــــە پال وێنەی قارەماندا ، وێنەی هەموو سوپاش تەواو نەخشەکێشراوەو لەبەرچاوە ٠

## داستانی دلداری‌و ئەڤین

ئەم جۆرە داستانە ، بۆیە لە ریزی ئیپۆس‌و داستانا باس ئەکرێت ، چونکە زۆرتریان ، بەتایبەتی لە کوردیدا ، تەنیا رووداوێکی ســـادەی ئەڤین‌و دلداری ناگێرنەوە ، بەلکو لە پال ئەوەشدا کەرەسەیەکی تیایــە کە لە داستانی قارەمانێتیدا بەدی‌ئەکرێت ٠

داستانی دلداری لە هەموو جیهانداو بە تایبەتی لە ڕۆژهــــەلاتدا سۆزێکی تایبەتی‌و هەستێکی قوول‌و ڕاستگۆیی‌یـــــەکی رووداوو هونەرمەندیی تیایە ، کە ئەیخاتە ریزی گەنجینەی ئەدەبی لیریکەوە ٠

داستانی دلداریی کوردی لەپال سۆزو هەست‌و خۆشــەویستی‌و وەفاداری‌و ڕاستگۆیی‌دا جۆرێك لە ئازایەتی‌و فیداکاری دەرئەخەن ٠

ئەم خاسیەتە وایان لێئەکات لە رووی ڕووداوەکان خۆیانو نزیکی‌یان لە ڕاستی‌و قەوماوی ڕاستەقینەوە . بەلکـــو لە کەسانو ڕووداوی ڕاستەقینەی مێژووەوە ئەیانباتە ریزی داستانی مێژوویی‌یەوە ، وە ئەم داستانانە ، هەر وەك هەموو داستانی دلداریی جیهانو بە تایبەتی ئەوی ڕۆژهەلات ، هەندێ ڕوخساری کۆمەلایەتی‌و ڕەوشتو خـــووشی ئەخەنە پێش‌چاو و کەرەسەی لێکۆلینەوەی کۆمەلایەتیش ئەدەن بـــە دەستەوە .

## داستانی دلداری‌ی خۆمالی‌و هاوبەش‌و بێگانە :

وەك ئەبینین داستانی دلداریمان ، بەلکو گـــەلێك چیرۆکی فۆلکلۆرمانو تەنانەت هـــەندێ وێنەی ناو گـــۆرانی‌و پەندی پێشینانمان لەگەل گەلانی‌تری ڕۆژهەلاتدا هاوبەشـــە . قادر فەتاحی قازی لە سەرەتا فارسی‌یەکەی « میهرو وەفا »دا نووسیوی‌یە :

« لە هەردوو زماندا ، لە فارسی‌و لە کوردیدا ، داستانی وا هەیـە کە لەناو و لە ناوەڕۆکدا یەکێتی‌یەکیان لە نێواندا هەیە وەك لـــەیلێو مەجنوونو خەسرەو و شیرین کە لە کوردیش‌و لە فارسیشدا هـەن . لەم بارەیەوە شتێك لـــە مێژووی ئەدەبیاتی ( هێرمان ئاتـــە )وە وەرئەگرین ، بەشـــکو ڕەگو سەرچاوەی ڕاستەقینـــەو جۆری پەیدابوونو مێژوویەکی بچـــووکی هەندێ لەم داســـــتانەمان بۆ ڕۆشن‌بکاتەوە .

لە مێژووی ئەدەبیاتی فارسی‌ی « هێرمان ئاتە »دا کـــە دوکتۆر ڕەزا زادە شەفەق کردوویەتی بە فارسی لە لاپەڕە (۷۲)دا ئەلێ :

زیاد لەمە ئەبێ ناوی لەیلێو مەجنوونێکی تر بەێن کە بـــە شێوەی « گوران »ی کوردی ناوچەی ڕۆژهەلات نووسراوەو بـــەهۆنراوی سادە ( یا عامیانـــــە )ی دە هیجایی ووتراوە . وە وەك لە پەراوێزدا

نووسراوه ئەم نوسخەیە لە مۆزەخـــانەی بەریتانیادا بە نیشـــانەی Add. 7829 دا دانراوە •

هەر لە ( ل ٨٤ )ی ئەو کتێبـــەدا ئەڵێ : لەیلو مـــەجنوونێك بە شێوەی گۆران لە چەشنی خەسرەو و شیرین هۆنراوەتەوە • هـــەر بەپێی پەرتووکەکە،ئەمیش ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیادا بە نیشانەی Add. 2828 دادانراوە •

لەپاڵ خەسرەو و شیریندا ، ( فەرهادو شیرین )یش بـــە کوردی هەیە • وە هەر لـــە کتێبی ناوبراودا دەربارەی داستانی بـــەهرامو گوڵەندام لە ( ل ٨٧ )دا نووسراوە : بەهرامو گـــوڵەندام لە داناتی ( ئەمین ەو پێش سالی ( ١١٤٧ی هـ ــ ١٧٣٤ی ز ــ ) نووســـراوە ( دەستنووسەکەی لە مۆزخانەی بەریتانیادایە ــ ١٤٢٣ ، ٥٣ ) کـــە چیرۆکی دلداریی ( کوڕی کیشوەرشاو گوڵەندام )ە • نوسخەیەك لەم داستانە بە شێوەی گۆران هەیە ، جیاوازیشی لە تێوانیاندا ئەوەیە ، کە لەمەی دووەمدا گوڵەندام شازادەی چینە ، لە یەکەمدا پـــەرییە • ئەوی شایانی باسە ئەوەیە کە ئەم ( ئەمین )ەی کراوە بە داتـــەری بەهرامو گوڵەندام ، دیار نییە کییەو لە لیستەی ئەو ناوانەدا کە لـــە مێژووی ئەدەبیاتی فارسیدا هەیە ناوی وا نەبراوە • بـــەڵام دوکتۆر ذبیح‌الله صفا لە ( ل ٧٩ )ی گنج‌سخن‌دا شمس‌الدین محمـــد کاتبی ترشیزی ( م ٨٣٩ هـ = ١٤٣٥ز ) بە دانەری بەهرامو گـــوڵەندام دائەنێ •

لە مێژووی ئەدەبیاتی ئاتـــەدا ( ل ١١٧ ) دەربارەی میهرو وەفا ئەڵێ « هەر ئەو ئەبو محمد رەشیدەی هاوعەسری مسعود ســـەعد سلمان بووە ، هۆنراوەیەکی حەماسیی ڕۆمانتیکی بـــە ناوی میهرو وەفاوە هەیە »[٥٦] •

لە کتێبی ڕۆژهەڵاتناساندا و لە هەندێ لە مێژوونووسانی ئەدەبیاتی فارسی ، جاروبار ئەم جۆرە ناوانە دێنو ئەکرێن بە دانەری ( بەیت )ی

کوردیو فارسیی بەناوبانگ • بەڵام پاش‌ووردبوونـــەوە ئەتوانین بڵێین بەشی زۆری ئەم داستانانە ـ ئەوانە نەبن کە ئەدرێنە پاڵ عـەلی بەردەشانی • دانەرێکی ئاشکراو ناسراویان نی‌یەو ئەم ناوانەش کـە ئەکرێن بە خاوەنی ئەم بەیت یا ئەو ، هیچ سەروشـــوێنێکی دیاریان نی‌یە • بۆیە لە مەیدانی تۆمارکردنی مێژووی ئەدەبیاتماندا هەموو ئەم داستانانە لە ریزی بەرهەمی خەڵکدا تۆمار ئەکەینو لە خانەی سامانی فۆلکلۆرماندا دایان‌ئەنێین •

بەڵام لێرەدا ئەبێ باسی ئـــەو داستانانە بکـــەین کە بە چـەند زمانێك‌هەن • ئایا کامەیان بە موڵکی نەتەوەی کـــــورد دائەنرێ • ئەوەی لە ڕەگەزەوە تانوپۆ و ڕووداوی هەر کوردی‌یە ؟ دیارەکـــە بۆ ئەدەبی فۆلکلۆر ــ هەرچی بە کوردی نووسرا یا ووترا ، ئـــەوە موڵکی تەواوی نەتەوەی کوردە • بەڵام شتێکیش هەیە کـــە پی‌ی بڵێین هاوبـەش • ئەمـــە لە ڕووی فۆلکلۆرەوە ، چونکـــە خۆی بەرهەمێکی گەلەو زۆر لە گەلان لە مێژوویاندا ، بە پلەی (لەیەك‌چوو)دا ڕۆیشتوون ، بۆیە ئەبینین ، تەنانەت لە سنووری هەموو جیهانیشـدا ، زۆر شتی فۆلکلۆری گەلان هەیە کە لەیەك ئەچن • چونکە سەرچاوەـ کەیان دەروونی گەلو وژدانو لێك‌دانەوەو جۆری ڕوانینە کارەساتو خۆشیو ترشیی ژیانی‌یەتی •

بۆ داستانی دڵداری ، ناتوانین بڵێین ، داستانی دڵداریی کــوردی هیچ شتێکی هاوبەشی لەگەڵ داستانی ڕۆژهەڵاتدا نی‌یە • بەڵکو (شا) داستانەکانی فۆلکلۆری کوردی ، یا لـــە ناوی قارەمانیدا ، یا لـــە ڕووداویدا ، هاوبەشی‌یەکیان لەگەڵ هاوێنەکانی خۆیاندا لـــە ئەدەبی فۆلکلۆری گەلانی‌تری ڕۆژهەڵاتدا هەیە •

لەوسەرچاوەیەی سەرەوەدا باسی شیرینو فەرهاد کرا کــە لەلای فارسیش هەیەو لای کوردیش ، بەڵکـــو لەلای تورکو ئازربایجانو هەندێ نەتەوەی‌تری ڕۆژهەڵاتیش هەیە • لای ئێمـــە لە فۆلکلۆرەوە

چۆتە قالبی ئەدەبی نووسراوەوە[٥٧] ، لای گەلانی تریش هەر بووە بە ئەدەبی نووسراو ، وەك ئەبینین گەلێك لە شاعیرانی گەورەی ڕۆژهەلات وەك نیزامیی گەنجەوی‌و ئەمیر خوسرەوی دەلهەوی ، داستانی شیرین‌و فەرهاد ، یا شیرین‌و خوسرەویان نووسیوە ، تەنانەت شاعیری هاودەمی تورك « نازم حیكمەت »یش چیرۆكێكی شیرین‌و فەرهادی هۆنیوەتەوە .

ڕەنگە ئەم داستانەیان هەر لە ڕووی بەسەرهاتەوە بكەین بە كوردی . چونكە تا ئێستا كێوی « بێستوون » لە خاكی كورددا ماوەو ئەو وەستایی‌و بەردتاشی‌یەش كە ئەڵێن كرداری ڕەنگینی فەرهادە هەرماوە .

هەروەها لەیل‌و مەجنوون ، یا وەك لەناو كورددا بە لەیل‌و مەجروون ناوبانگی دەركردوە . ئەم داستانە بە پێچەوانەی شیرین‌و فەرهادەوەیە . ئەمیان سەرەتاكەی لای ئێمەوە دەستی‌پێ‌نەكردوە . بەلكو وەك لە ناوی قارەمانەكانی‌یەوە دیارە ، بناغەكەی هەر ئەو چیرۆكی فۆلكلۆری عەرەبەیە ، كە لە ناو عەرەبدا دەربارەی خۆشەویستیی « لەیلا »و « قەیسی كوڕی مولەوەح »ەوە ئەگێڕێتەوەو لە پاشان‌و تەنانەت لە سەدەی بیستەمدا بۆتە ئەدەبی نووسراوەو لە ناو گەلانی تری ڕۆژهەلاتیشدا ، چ بە فۆلكلۆری‌و چ بە ئەدەبی نووسراوە ، هەر بلاوە . وەك ئەبینین دیسان نیزامیی گەنجەوی بە فارسی « لەیل‌و مەجنوون »ی نووسیوە ، هەر وەك « فضولی »ی شاعیری گەورەی « تورك‌ئازەری » ئەم داستانەی خستۆتە قالبی هۆنراوەوە .

« لەیل‌و مەجروون » لە ناو كورددا چەند سەدەیەك هەر فۆلكلۆری گەل‌بوو ، تا لەم دوایی‌یەدا ئەویش چووە ریزی ئەدەبی نووسراوەوە[٥٨] .

بەداخەوە ، شێوە فۆلكلۆری‌یەكەی « لەیل‌و مەجروون ■

لەبەردەستا نی‌یەو تەنانەت نەش‌نووسراوەتەوە ، بەلاّم چ بــــە بیستن بێت‌و چ بەلگەی ئـــەدەبە نووسراوەکەی کوردی‌و فارسی‌و ئازەری بێت ، ئەوە دیارە هەرگـــــەلێك لەوانەی ئەم داستانەی لە عەرەبەوە وەرگرتبێ ، داستانەکەی بردۆتە ناو خۆیەوەو شەقلی تایبەتی‌ی خۆیی لێ‌داوەو لە ناوی قارەمان‌و هـــــەندێ شتی بنەڕەتی‌ی رووداوەکان بەولاوە چ مافێکی فۆلکلۆری عەرەبی‌ی بەسەرەوە نەماوە •

هەست‌و عاتیفەو وێنە لەم داستانەدا بووە بــــە کوردی • ناوی دەشت‌و چۆل لە فۆلکلۆری عەرەبەوە وەرگیراوە ، بەلاّم هـــــەست‌و وێنەی ناو داستانەکە وێنەی کەژو چیایە • ئەم دیمەنەی لە « لـــەیل‌و مەجنوون »دا بەدی‌ئەکرێ ، لە کردنە فارسی‌و تورکی‌یەکەی شـــیرین‌و فەرهادا نابینرێ ، چونکە وێنەی سروشت لە وولاّتی ئەم سێ گـــەلەدا هەر لەیەك ئەچێت‌و گۆڕینێکی ئەوتۆی بەسەرا نایەت •

ئەم دوو داستانە گەورەترین داستانی کوردین ، کە هـــاوبەشی‌یان لەگەلّ داستانی گەلانی‌تردا هـــــەیێت • لە پالّ ئەمانەشـــــدا وردە داستانی‌تری هاوبەشمان هـــــەیە • بۆ نموونە : لە فۆلکلۆرو ئەدەبی نووسراوی ئەم سەردەمەی ئەرمەنیدا گەلێك ناوی قارەمان‌و ناوەڕۆکی داستانی کوردی وەرگیراوە• وەك «خەج‌و سیامەند ، حەسۆ و زلخە•• هتد » • دیسان هاوبەشی‌ی سروشت‌و مێژوو وای کردوە کە داستانە ئەرمەنی‌یەکانیش لە زۆر دیمەنا لە کوردی‌یەکە بچن ، بەلاّم وەرگێڕانە ئەرمەنی‌یەکە شەقلی تایبەتی‌ی کوردی‌ی لەکیس نەداوە •

## داستانی زەمبیل فرۆش

ئەم داستانە لە ناو کورددا زۆر بلاّوەو ڕۆژهـــــەلاّتناسانیش زۆر بایەخیان داوەتێ‌و بەچاپ‌کردن‌و کۆکردنەوەیەوە خەریك بوون(٥٩) •

ئەم داستانە زۆر دیمەنی ژیانی کوردەواری ئەخاتەڕوو،وە ئەتوانین

به هه‌ڵقه‌یه‌کی دابنێین ، که داستانی قاره‌مانی بیـــــه‌ستێ به داستانی دڵداری‌و ئه‌ڤنه‌وه •

ئه‌م داستانه بڕیارو خواست‌و له‌سه‌رکار سووریی ئافره‌تی کـورد پێشان ئه‌دات •

له‌م داستانه‌دا وێنه‌ی له‌خۆبوردن‌و ئازایه‌تی ئه‌بینین ، هه‌روه‌ك لـه ڕووی کۆمـه‌لایه‌تی‌یه‌وه شـه‌قڵی تایه‌تی ڕه‌نج کێشان وا بـه داستانه‌که‌وه • « زه‌مبیل فرۆش » به ڕه‌نجی شان نان په‌یدا ئـه‌کات‌و به به‌رزی ئه‌ڕوانێته ڕه‌نج کێشان‌و ئه‌مه‌گداری • هه‌ر وه‌ك سه‌رتاپای داستانه‌که په‌سندی‌ی ڕه‌وشت‌و خوو و پاکی‌ی پیاوی هـه‌ژاره ، ته‌نانه‌ت داستان گێڕه‌وه به‌هه‌شتیش به مولکی ئه‌وان ئه‌زانێ •

ئه‌م داستانه ـ له نوسخه‌کانی فۆلکلۆردا ـ تابلۆیـه‌کی ڕه‌نگینی ژیانی کۆمه‌لایه‌تی‌ی کورده • پێوه‌ندی‌ی ناو ده‌سته‌و کومه‌لانی خه‌ڵك پیشان ئه‌دات ، لایه‌ك له ژیانی ئافره‌ت‌و له ژیانی ناو کۆشك‌و تـه‌لاری سه‌رده‌می کۆنی ده‌ره‌به‌گایه‌تی پیشان ئه‌دات • له ڕووی ژانریشـه‌وه هه‌نگاوێکه به‌ره‌و داستانی ڕاسته‌قینه‌ی ئه‌ڤین •

**خه‌ج‌و سیامه‌ند:** هه‌موو داستانه‌کانی دڵداریی کوردی ، له‌گه‌ڵ باسی ئازایی‌و کۆڵنه‌داندا ، وێنه‌ی وه‌فاداری‌و قسه‌و په‌یمان بردنـه ئه‌گۆڕه‌وه‌ن • له هه‌موو داستانێکی دڵداریی کـوردیا سۆزی ئه‌ڤین‌و دڵداری‌یه‌که‌ی ڕۆژهه‌لات به‌دی ئه‌کرێت ، له ناو ئه‌مانیشدا ، دیسـان دیسه‌نی کێشه‌یه‌ك هه‌ر دیاره • کێشه‌ی نێوان چاکه‌و خـراپه ، نێوان پاکی‌و ناپاکی ، وه‌فاداری‌و سه‌رڕاستی له‌گه‌ڵ بێ‌په‌یمانیدا •

لێره‌شدا دیسانه‌وه گیانی میللەت ده‌رئه‌که‌وێت‌و کێشه‌که له‌لایه‌کی تره‌وه ئه‌به‌سترێته‌وه به‌و کێشه‌یه‌وه که له ژیانی کۆمه‌لایه‌تیدا هـه‌یه • بۆیه زۆر جار ئه‌بینین قاره‌مانی داستانی دڵداری پیـاوی ڕه‌نجبه‌رو زه‌حمه‌تکێشه‌و له هه‌موو خاسیه‌تێکی ئه‌م که‌سانـه‌دا له ڕه‌وشت‌و

کردارو سەر ئەنجامیدا ، وێنەی مەردایەتی‌و ئازایـــەتی‌و وەفاداری‌و خۆبەخت‌کردن دیارە •

چەند داستانی کوردی هــــەیە کە چیرۆکی حــــەزکردنی کوڕە جوتیارمان لە کچە ئاغا بۆ ئەگێڕێتەوە • ئایا ئەتوانین باسی دڵداری‌یەکە ( کەلا ) بخەین‌و ئەمە بکەینە نموونەیەك بۆ ئاواتە هەمیشەیی‌یەکـــەی ئادەمیزاد • ئاواتی بە ژیانی باشترو خۆشتر گەیشتن ؟ زۆر جـاریش هەیە کە هەر ئەو کچە ئاغایە کەس‌و ئامۆزاو خزمی کوڕە جوتیـارە ، وەك لە داستانی خەج‌و سیامەندا ئەیبینین[٦٠]• ئەو داستانەی کە هــەر بە تەواوی داستانی کوردەو بەشێکە لە گەنجینەی نەتەوایەتی‌ی ئێمەو لە ناو کورددا زۆر بڵاوە[٦١] •

عوبەیدوڵلای ئەیوبیاز لە پێشەکی‌یە فارسی‌یەکەی چاپەکـــــەی خەج‌و سیامەندا نووسیویە : « مێژووی ژیانی خەج‌و سیامـەند دیار نی‌یە•ئەم بێ مێژوویی‌یە بەقسەی یەکی لە مامۆستایان شتێکی تایبەتی‌ی خەڵکی چیایە ، بەیتی خـــەج‌و سیامەند وێنەی گیان بـــەخشینە ، داستانێکی ڕاستەقینەیە کە لە سەرگوزەشتەی سۆزمەندی سیامەندی قارەمان‌و ئارەزووی سادە ، بەڵام گیانبەخش‌و لە عەشق‌و وەفاداری‌و گیان بەخشینی ( خەج )ی فیداکار وەر گیراوە »[٦٢] •

بە پێ‌ی ئەو پێشەکی‌یە خەج‌و سیامەند خەڵکی دیهاتی ســـــەر سەوزو بەرزی « کیلەسپیان »ی ناوچەی مەهابادن[٦٣] • بەڵام جۆرە گێڕانەوە کرمانجی‌یەکەی « سپیان » ئەباتە لای دەریای‌وان[٦٤] •

لەم داستانەوە ئەتوانین « لە بیری ڕووناك‌و دەروونی زینـــدووی میلی‌و هونەری خەڵکی کوردستان بگەین ، ئەم داســـــتانی عەشق‌و ئەڤینە کە لە وێنەی خۆی کەم هەیە ، چونکە بە شـــێوە هونەرێکی سەرنج ڕاکێشەر نووسراوە ، جۆری بیرکردنەوەی کوڕوکچ لـــــە دڵداری‌و عەشق‌و خۆشەویستیداپیشان ئەدات‌و لـــە سنووری خۆیدا یەکێکە لە بەرهەمە بە دیمەنـــەکانی دەروون‌و دیمـــەنی مەعنەوی

ناو کوردان »[٦٥] .

لەم داستانەشدا وەك هەموو داستانی دلداریی قەدو لووتکەی چیای کوردستان ، وەك چیرۆکی بن‌دارو دەوەن‌و ناو وەردو کۆڕی درویّنەو کۆڵکیّشان ، « خەج‌و سیامەند » دلیان بە یەکدا ئەچیّت‌و پەیمانی دلداری‌و وەفاداری ئەبەستن . کەسوکاری خەج ڕازی نابن کچی خۆیان بدەن بە سیامەندی هەژار با ئامۆزای خۆیشی‌بیّت . بۆیە خەج بڕیاری ئەوە ئەدا لەگەڵ سیامەندا سەری خۆی هەڵگرێ . سوارەی عەشرەت دوایان ئەکەون ، سیامەند شەڕیّکی ئازایانە ئەکات تا دوایی تیریّك جگەری ئەسمێ‌و لەسەر لوتکەی چیای بەردینەوە گلۆر ئەبیّتەوەو ( خەج )یش دوا بە دوای ئەو خۆی فڕێ ئەداتە خواری‌و لە پاڵ دلدارەکەیدا ئەمرێ .

سیامەند لە سەرەمەرگا ڕووئەکاتە خەج‌و ئەڵێ :

« سیامەند گاز دەکا : وەی لە من ( خەج )ێ ، وەی لە من ...
توخو ( خەج )ێ ، بەو سەرو ڕووی سوورەوە ، بەسە مەکە ـ هەی ڕۆ ـ ڕۆ و گریانێ .
میهرو جەمبەری خۆشەویستت لە دلما تاکو مەرانێ . ئاوریّکی بەرداوەمەوە لە هەناوی ، نە بە گوڕەژنی شیبای نیوە شەوێ دەکوژیّتەوە نە بە پریژکاپریژکی دە بارانێ .
بۆچرووکیّکم لە تەمەنی هەلدەستی لە گوێین هەوری ڕەش دەگەریّتەوە کەلیّنی ئاسمانێ »[٦٦]

لەم داستانەدا هەروەك نائومیّدی‌و کارەسات پیشان ئەدرێ ، هەروا تا سەرەمەرگ دەست لە خۆشەویستی‌و وەفاداری هەلنەگرتنیش دیارە .

سیامەند لە سەرەمەرگا بە خەج ئەڵێ :

« ئاخ ... ئاخ ... ئەمن چ بکەم : ئەم‌ماوە مەودای دەس‌کردنەودی جەنگەی دە خۆرئاوانێ .
ئاخ دەستم ناگریّتەوە شینگی گەروماری چرگەی خەنجەری دەبانێ .
لە بۆت بگرمەوە سەرو خواری وولاتی کرمانجانێ شەش دانگی دە

گۆڤه مه‌ینه‌تی .»[٦٧]

خه‌ج که ئه‌م دلسۆزی‌یه‌ی سیامه‌ند ئه‌بینێ ، سه‌ره‌نجامی خۆی ئه‌به‌ستێ به‌وه‌وه‌و له‌ناو جه‌رگه‌ی نائومێدی‌یا بریاری خۆی ئه‌داو ئه‌بێته وێنه‌ی وه‌فاو ئازایه‌تی ، براکانی لێی نزیك ئه‌بنه‌وه ، بیکوژن بزای له‌گه‌ڵ سیامه‌ندا هه‌ڵاتێ ، به‌ڵام ئه‌و بانگ ئه‌کات :

« چا به خوا ! ئه‌مه‌وانه‌ی دێن ، چ هۆ میهرو گژین ، چ کومێڵو داشپێژن .
چ مێ گه‌لن ، چێژن ، لیم خۆشن یا زوێرن .
ناتوانن سیامه‌نده گیان ، تا پشوویه‌کم مابێ له تۆم ببوێرن .»[٦٨]

سیامه‌ند له لووتکه‌ی چیاوه که‌وته‌خوارێ ، پێش ئه‌وه‌ی براکانی خه‌ج بگه‌ن ، خه‌جیش خۆی فڕێ ئه‌داته خواره‌وه‌و پێش ئه‌وه‌ی بمرێ شینێك بۆ سیامه‌ند ئه‌کات ، که له ڕاده‌ی شینه‌که‌ی زینداییه بۆ مه‌م‌و ته‌واو له پارچه‌یه‌ك ئه‌چێ که شاعیری گه‌وره‌ی ڕووس لێرمانتۆڤ له داستانی « دایمون ــ دێو »دا نووسیویه‌تی که ڕه‌نگه هه‌ر گیانی ڕۆژهه‌ڵات‌و گه‌شتی قه‌فقاس ئه‌و ئیلهامه‌ی دابێتێ .

خه‌ج ئه‌ڵێ :

چا ژیان بۆ چی‌یه ؟ گیان بۆچی‌یه ؟
چۆن بڵێن ئه‌وه‌تانێ ماوه ، خه‌جی سیامه‌ندی‌یه .
به خودای ، خودای پاکی ، به یه‌زدانی ڕووناکی .
سوێند به جوانی‌و چاکی ، به ( تو ) ڕۆڵه‌ی ئاو و خاکی .
به خۆشه‌ویستی‌و جوانی ، به مه‌رگ‌و به ژیانی .
به ڕۆژی ئاسمانی ، به ئاوی ڕوونه‌که‌ی کانی .
به پیری کامه‌رانی ، لاوۆ هه‌ر تۆم خودانی .
به چاکی که‌سکه‌وانی ، به سووره‌گه‌نم‌و نانی .
له مرنی یا له مانی ، بزانی یا نه‌زانی .
به ڕاستی‌و ڕه‌وانی ، سیامه‌ند گیانی گیانی .
لاوۆ هه‌ر تۆم خودانی ،
لاوۆ هه‌رتۆم خودانی .
تا ماوم به ته‌ماتم . ئه‌زیش به دووتدا هاتم »[٦٩]

ئه‌م کۆتایی‌یه تراژیدی‌یه‌ی مه‌رگی خه‌ج‌و سیامه‌ند کوشتنی ئاوات

نی یه له دلا ، سەرشۆڕکـــردن نی یه بۆ زۆرداری ، وێنـــەی بەدی کارەسات بینین نی یه له کۆڕی ژیانا ، بەڵکو هاوارێکـــه بۆ هەوڵدان بەرامبەر بەو هەموو ڕێگەو شوێنەی کارەسات ئەهێننه کایەوە .

خەج بەر له مردن باسی له مەرگی خۆی ئەکات و ئەڵێت :

(( راسپێرم بێ ، منیش له (( زارگەلێ )) له تەنیشت گۆڕی سیامەندە خۆشەویستەکەم ، ناکامی ، جوانەمەرگی بنێژن .

ئەو چیرۆکه تاڵ و شیرینه ، بەسەرهاتی دوو جەهێلی ناکامه بگێڕنەوە بۆ منالان بۆ کوڕو کچانی دەگرمانجاتی بیبێژن .

ئەو دای و بابانەی کچیان بێ دڵدەکەن ، به زۆری به مێردیان دەدەنه تالی ئەو هینگه ( ڕاوــڕاوه ) نالەبارەی بچێژن .

ئەو کچانەی ڕوو دەکەنه گۆڕی دڵدێڕێ ، پێکای ئەرلەو ئـــەمەگی تالی ئەو هینگه ( ڕاوــڕاوه ) نالەبارەی بچێژن .

دەبلێن ، خۆشتر بژێتەوەو ڕاوەستاوێ دابی بـــەرزی خوازبێنی و کچ به مێردانی کرمانجاتی به دڵی کوڕو کچـــانا ( شوێنی دای و بابانه ) گەلێ ــ گەلێ هێژاو لەمێژن[٧٠] .

چ لەم داستانەدا و چ له هـــەموو ئیپۆس و ئیپۆپیـــاکانی تری کوردی یەوه ، ئەنجامێکمان دەستئەکەوێت . ئەویش ئەوەیه کـــه قارەمانی ئەمانیش وەك چیرۆك ، هەر ئادەمیزاد خۆیـــەتی ، ئەمـــه لەلایەکەوه ئەوەمان پیشان ئەدات که داستان بەرهەمی پاش ئەفسانەیه له مێژووی ئەدەبی کورداو له لایەکی ترەوه ئەو بایەخ و نرخه گەورەیه دەرئەخا که لەناو گەلدا ئەدرێ به ئادەمیزاد . به ژیانی ، بـــه هەستی دەروونی ، به هەڵسوکەوتی .

لێرەدا ، لەتوانادا بوو به درێژی باسی گەلێك داستانی تری کوردی بکرێـــت . وەك (( شیرین و فەرهاد ))و (( مێـــرو وەفا ))و (( لاس و خەزال )) ... هتد . بەڵام سروشتی ئەم باسه کـــه تێکرا دەربارەی فۆلکلۆری کوردی یه ، ئەو باسانەی هەڵگرت بۆ لێکۆڵینـــەوەی تری لەمەودوا .

(١) واته (محسوس)ە .

(٢) سەرچاوەی ئەم چەند لاپەڕەیە کتێبی « سەرەتایەکی ئەدەبیاتناسی »ی تیمۆفیێڤ و . م . گۆلۆفینچینکۆ ـ چاپی موسکو ١٩٦٤ ـ بوو .

(٣) کەلچەر ـ یا کلتوور ـ واته ـ ثقافة .

(٤) م.گۆرکی : چەند ووتاری ئەدەبی ـ لە رەخنەدا ، مۆسکۆ ، ١٩٣٧ . ل ، ٣٦ .

(٥) چێرنشێفسکی : بەرهەمە تەواوەکانی ، بەرگی١١ ، مۆسکۆ ، ١٩٤٩ . ل ٣٥٨

(٦) م.گۆرکی : ئەرکەکانی سۆفییەتی ئەدەبیات . باکۆ ، ١٩٣٥ . ل ، ٨

(٧) خ.ئەبۆڤیان ، کوردان ـ گۆڤاری « قەفقاس » تبلیس ، ١٨٤٨ ، ژ ، ٤٧ . ل ، ١٨٨

(٨) ن.یا.مار ، دیسان دەربارەی ووشەی « چەلەبی » ـ دەستنووسەکانی بەشی رۆژهەڵاتناسی ی « کۆمەڵەی ئارخیۆلۆگی » ب . ١٥ . سانپیتەربورگ ، ١٩١١ ، ل ، ٣٠٠

(٩) ئەمە لە « گۆرانی و حیکایەتی فارەمانیێتی کوردی »ی چاپی مۆسکۆ ، ١٩٦٢ (ل ـ٧)ەوە وەرگیراوە .

(١٠) ف.پ نیکیتین ، کوردان چاپی رووسی ی مۆسکۆ ، ١٩٦٤ ، ل ، ٣٦٢ .

(١١) هەر ئەو سەرچاوەیە : ل ١٣٦ .

(١٢) وا ئەزانم بەرپەچدانەوە لەوەدا نەماوە کە باباتاهیری هەمەدانی ( ٩٣٥ـ١٠١٠ )م یەکەم شاعیری ناسراوی کوردە ، بەم پێیە کەم نەتەوە هەیە ئەدەبیاتی نووسراوی پێش کورد کەوتبێ .

(١٣) بڕوانە : تیمۆفییێف ، ڤینگروف ، فەرهەنگێکی کورتی ئیستلاحە ئەدەبیەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٥٨ ، ل ٨٣ ، ٨٤ .

(١٤) بڕوانە ، ت.ف. ئەریستۆفا ، کوردی پشت قەفقاس ، مۆسکۆ ١٩٦٦ ، چاپی رووسی ، ل ١٧٠ .

(١٥) پرۆمیتیۆس : مانای چاوبین ، پادووربینە .

(١٦) دەربارەی ئەم ئەفسانەیە لە زۆر سەرچاوەدا شت ئەبینین ـ بۆ نموونە تەماشای ـ ل ٢٤٧ ـ ٢٤٩ ی « سەرەتایەکی ئەدەبیاتناسی »ی گۆلۆفینچینکۆ ـ چاپی رووسی ـ موسکو ١٩٦٤ بکە ، یا ، « الادب وفنونه »ی دوکتور محمەد مەندوور ـ قاهیرە ١٩٦٣ ، ل ١٠٧

(١٧) علاء الدین سجادي . مێژووی ئەدەبی کوردی . بەغدا ، ١٩٥٢ . ل ، ١٠١ .

(١٨) قورئانی پیرۆز ، سورەتی کەهف ، ئایەتی ٦٧ .

(١٩) لێرەدا « مەغریب » هەر وولاتی ـ بۆتان ئەگرێتەوە . هەرچەندە لە بادینانیش گوندێکی وا هەیە .

(٢٠) عەمی ئالان ، شام ١٩٥٨ . ل ، ٣ ، ٤ .

(٢١) بەدەختەوە ، ئەم بەشەی ئەدەبی گەل ، وەک لەوانەی تر زۆر کەمی لێ کۆکراوەتەوە . وە ئێمە لێرەدا ویستمان پشت هەر بە چاپکراوەکان ببەستین .

(٢٢) مێژووی ئەدەبی کوردی ل ٥٨٩

(٢٣) توفیق وهبي . قواعد اللغة الكردية . ج ١ . بغداد ١٩٥٦ . ل ، ٤٥

(٢٤) هەر لەوێ ل ، ٤٩

(٢٥) جو ، مناخ ، نەووهەوا .

(٢٦) نوري علي امين : چیرۆکی « کاکۆل زەرینودانمرواری » . بەغدا ، ١٩٦٥ ، ل ٢٤ ، ٢٥

(٢٧) پیرەمێرد . دوازدە سوارەی مەریوان . سلێمانی ، ١٩٣٥ .

(٢٨) پیرەمێرد . پەسی ئەفسانەیی راستی تاریخی . سلێمانی ، ١٩٤٢ .

(٢٩) ئەم چیرۆکەیان تائێستا چاپ نەکراوە ، وەک بیستوومە لە کاتی خۆیدا لەسەر شانۆ ، لە سلێمانی ، بە چاودێری پیرەمێرد خۆی و یارمەتی پێکەس پیشاندراوە ، لە کاتی خۆیدا قەدەغەکراوە . نازانم دەستنووسی ئەم بەرهەمە لە کوێ هەیە .

(٣٠) پیرەمێرد . دوازدە سوارەی مەریوان . سلێمانی ، ١٩٣٥ ( سەرەتا ) .

(٣١) مەبەس لە ئەدەبی نووسراو ئەدەبی پاش فۆلکلۆرە ، کە خاوەنی دیارەو نووسراوەتەوە .

(٣٢) ئەریستۆ ، « پۆیەتیکا » ، چاپی رووسی ی مۆسکۆ ١٩٥٧

(٣٤) هیگل ، « لێکچەرەکانی ئیستاتیک » چاپی رووسی ی مۆسکۆ ، ١٩٥٨ ، ل ، ٢٥٧

(٣٢)(٣٥) شەنیمرقا زومروود ، زاری پۆیمە لە هۆنراوی ئیستای کوردیدا ، « ئەفۆ ـ ریفیرات بە رووسی » باکۆ ١٩٦٧ . ل ، ٧ .

(٣٦) بۆ ئەم باسەش ـ ئەمانەی « گۆنۆفینچینکۆ » ل ٢٤٣، ٢٤٤ کراوە .

(٣٧) عوبەیدوللای ئەیوبیان ، چریکەی مەموزین . کوردی : فارسی . تەوریز ١٣٣٩ . ل ، ١٠

(٣٨) وا ئەزانم ئەم باسە سەرەتایەکی باشە بۆ باسی شانۆی کوردی .

(٣٩) محەممەد توفیق وردی ، فۆلکلۆری کوردی ، ب ١ ، بغدا ١٩٦٨ ، ل ١٩

(٤٠) هەر ئەو سەرچاوەیە ، ل ٢٧ ، ٢٨

(٤١) هەر ئەو سەرچاوەیە ، ل ٨ ، ٩

(٤٢) هەر ئەو سەرچاوەیە ، ل ٨

(٤٣) محەممەد توفیق وردی . خانزادو لەشکری . بغدا ، ١٩٦٠ ل ٢٢

(٤٤) هەر ئەو سەرچاوەیە ، ل ٢٣

(٤٥) هەر ئەو سەرچاوەیە ، ل ٢٤

(٤٦) فۆلکلۆری کوردی ، ب ١ ، ل ٢١

(٤٧) مێژووی ئەدەبی کوردی ، ل ٤٥١

(x) فەرهەنگی ئەدەبی ، ل ٨٤

(٤٨) فۆلکلۆری کوردی ، ب ١ ، ل ٢١ ، ٢٢ .

(٤٩) O. Mann, Kurdische-Persische Forschungen .
Die Mundart der Muk ri-Kurden, Berlin, 1906
Abteilung IV, Bd III, T.I.

(٥٠) جلیلوف.ئو.ج.ئیپـــــــۆسی قارەمانەی « خانی‌دەست زێڕینی »ی کـــوردی (بەڕووسی) . مۆسکۆ ١٩٦٧ .

(٥١) جەمیلەی‌جەلیل . گلامید جمانەا کوردا ، یەریڤان ، ١٩٦٤ . ل ١٤١

(٥٢) دوکتۆر ئۆردیخان جەلیل ، ئەو سەرچاوەیە . ل ٦٣ ، ٦٤

(x) بەهیوای .

(x x) مینا ، وەك .

(x x x) ئەرێم ، هەمیشە .

(٥٣) بێناف ، بەدناو

(٥٤) کوردۆیف . ق.ك. چیرۆکو گۆرانیی داستانی‌کوردی مۆسکۆ ١٩٦٢ ل ١٢٣ ، ١٢٤ ( بـــەڕووسی ) .

(٥٥) الواقعیة في الادب الکردي ص ٤٢

(٥٦) منظومه کردی « مهرو وفا » ( متن کردیو ترجمه فارسی ) ، ضبطو ترجمـــــەو توضیح از قادر فتاحی قاضی ، تبریز ١٣٤٥ ص ٤ ، ٥ .

(٥٧) بەناوبانگترین وێنەی نووسراوەی ئەم داستانە بە کوردی ، هۆنراوەکەی خـــانای قوبادی‌یە .

(٥٨) لەیلو مەجنوون . وەرگێڕودانەر :عبدالجبار ئاغای کانی ، چاپی ٣، هەولێر ١٩٦٩

(٥٩) گەلێك لە ڕۆژهەڵاتناسان زەمبیل‌فرۆشیان کۆکردۆتەوەو چاپیان کردوە ، لەمانـــە « ژابار لیرخ‌و ماکاش » ئەژمێردرێن ، هەروەك لە ناو کوردی ســـۆڤیەتدا ـ دوکتۆر حاجی جوندی‌و شاعیر جاسمی جەلیل کۆیان‌کردۆتەوە ، بەم زوانەش لە مۆســـکۆ چاپکراو و وەرگێڕاوی ڕووسیی هەموو نوسخەکان دەرئەچێ .

بەڵام لەم دواییەدا ( هەولێر-١٩٦٧ ) گیوی موکریانی چاپێکی ( ســــــۆرانی‌و کرمانجی )ی زەمبیل‌فرۆشی دەرکردوە . ئەوەی تا ئێستا بیستبووەمان ئەوە بوو کە زەمبیل‌فرۆش داستانێکی فۆلکلۆر بووە . بەڵام موکریانی ســــۆرانی‌یەکەی ئەداتە پاڵ مەلا ئەحمەدی مەلا مەولوودی شنۆیی‌و لە زمان سەیدا شێخ بەشـــیری شێخ محەمەد ناعیرەوە کرمانجی‌یەکەش ئەداتە پاڵ مرادخانی بایەزیدی کە لـــە سالی ( ١١٩٠ )ی هـ . دا وتویەتی . لە ڕاستی‌یا ئەگونجێ کە هەردوو قســـە ڕاستبن ، ئەبێ ، کە زەمبیل فرۆش لە سەرەتادا هەر داستانێکی فۆلکلۆری نـــاو

خەڵك بوویێتەو ئەم دوو شاعیرە هاتبن داینرشتبێتە قاڵبی هۆنراوو ئەدەبی نووسراوەوە . لە ڕووی ووشەو وێنەوە هەردوو چاپکراوەکەی هەولێر سادەیی و ساکاریی ئەرگیناڵە فۆلکلۆرییەکەیان تێکنەداوە . بەڵام لە ڕووی داڕشتنەوە ، لە وەزنی پەنجەی کوردییەوەو لە تەرزی داستانەوە بردویانەتە قاڵبی عەرووزەوە .

هەروەها لەم چاپەدا زەمبیل فرۆش بە قارەمانێکی ڕاستەقینەی ناسراو دائەنێ و ئەڵێ : ناوی میر سەعیدی کوڕی حەسەن پاشای دیاربەکری بووەو خۆی خستۆتە بەرگی زەمبیل فرۆشێکەوە .

بروانە ( چیرۆکی زەمبیل فرۆش ، هەولێر ، ١٩٦٧ ) .

٢ ـ شاعیرانی کوردی سۆڤیەتی . (بە ڕووسی) . یەریڤان ، ١٩٥٦ز .

٣ ـ قصص شعرية كردية فولكلورية ، ترجمة محمد توفيق وردي ، بغداد ١٩٦٥ ص ٩ ـ ١٦

(٦٠) چریکەی خەج و سیامەند ، عبدالله ئەیوبیان ، تەوریز ، ١٩٥٦ ، ل ٢٠ .

(٦١) خەج و سیامەند هەر وەك بە دوو دایلێکتە گەورەکەی کوردی هەیە ، لە زۆر ناوچەی جیاوازی کوردستانا بە جۆری قسەکردنی ناوچەکە ئەم داستانە بڵاوە ، ئەوەی تا ئێستا چاپکراوە ، ئەوەیە کە لە یەریڤان دوکتۆر حاجی جوندی لە ١٤٨ لاپەڕەدا لەگەڵ ناوەڕۆکەکانی تری کتێبی « ئەفسانەکاری کرمانجا سۆڤیەتی ـ ١٩٥٧ » دا بە ناوی کورتەی ( سیابەندو خەجێ زەری ) وە چاپی کردوە ، هەروەها ئەو چاپەی عبدالڵەی ئەیوبیانە کە باس کرا هەروەکو م.ت.وردی لە ناوچەی شەقلاوە جۆرێکی ئەم داستانەی نووسیوەتەوە .

(٦٢) عبدالله ئەیوبیان ، پێشەکی چریکەی خەج و سیامەند ، تەوریز ١٩٥٦ ، ل ١٠ .

(٦٣) ئەو سەرچاوەیە ، ل ١٠ .

(٦٤) وەك لەو بەیتی خەج و سیامەندەدا دیارەکە هیشا بەراوەری بە گۆرانی ئەبێت .

(٦٥) ع.ئەیوبیان ، هەرئەوێ ، ل ١٠ ، ١١ . (٦٨) هەر ئەوێ ل ٤٨ .

(٦٦) ئەو سەرچاوەیە ل ٤٠ . (٦٩) ل ٥٢ ، ٥٤ .

(٦٧) هەر ئەوێ ، ل ٤٢ . (٧٠) ل ٥٢ ، ٥٣ .

زانای ناسراوی کورد محەمەد جەمیل بەندیی ڕۆژبەیانی لە کاتی لێدوانی لە سەم باسەدا چەند بەیتێکی بۆ خوێندمەوە کە هەر شانامەیە بەکوردی ، بەڵکو بەراوردی شانامەی فارسی و کوردیی لەبەر ڕۆشنایی ئەو چەند بەیتەدا ئەکرد . بەڵام بە داخەوە ، ئەوە هەر چەند بەیتێ دیر ، هۆنراوێك بوو کە بیری تیژی منداڵی لە دەوروبەری ئەو زانایەدا هێشتوێتییەوە . ئەڵامەت ئەوەیە کە بە بەڵگە دائەنرێ بۆ ئەوەی کە شتێکی وەکو شانامە بە کوردی نووسراوەو تا ئێستا نەگەیشتۆتە چاپخانە .

# گـــــــــۆرانی

**سەرەتایەکی تیۆری :**

گۆرانی کۆنترین بەشی ئەدەبی فۆلکلۆرە . هــەر وەك بەشێکی دیاری هۆنراوی لیریکە . ئەم هونەرە لە زۆرکۆنەوە پەیدابووە ، هەر لەو کاتەوە کە هێشتا هوشیاریی گەل لە ڕادەیەکی نزمدا بووە .

هەندێ زانایان لەسەر ئەوەن کە گۆرانیی شـــوان ، کۆنترین جۆری گۆرانییە ، چونکە شوانێتی بەلای ئـــەوانەوە لە کشتوکاڵ کۆنترە ، هەرچەندە زانای ئەوتۆش هەیە کە شوانیو مـــەڕومالات مالیکردن بە بەشێك دائەنێ لە کشتوکاڵ . بەلام وا ئەزانم ، گـــەر گۆرانی لە ئیشکردنەوە پەیدابوبێتـ وەك لەمەودوا باسی ئەکەینـ ئەوا ئەبێ ئادەمیزاد هەر لەکاتی میوە چنینەوەی دەوری ســـەرەتایی ژیانەوە گۆرانیی هەبووبێ .

لە زانستی فۆلکلۆرناسیدا دوو ڕای جیاواز دەربارەی سەرەتای گۆرانی هەیە ، کە هەر ڕایە خاوەنەکـــەی ئەباتەوە سەر ڕێچکـــە گەورەکەی باوەڕی فەلسەفی ، ئەم دوو ڕایەش ئەوەیە کـــە بە لای کۆمـــەلێك فۆلکلۆرناســـەوە گۆرانیی ئیشکردن کۆنتـــرین جۆری گۆرانییە . بە لای هـــەندێکی ترەوە گـــۆرانیی ئاینی کۆنترین جۆرییەتی(١) .

لە جیهانی ئەدەبیاتناسیدا شەقلێك کە فۆلکلۆر لە ئـــەدەبی ووتراو یا نووسراو جیابکاتەوە ، ئەوەیە کە فۆلکلۆر دیمەنی (کۆمەلەبوون) ، چ لە دانانیاو چ لە وتنەکانیا دەرئەبڕێ . گۆرانییە ـ زۆرجار بـــە کۆمەڵ ئەووترێ . ووتنـــــە ـ بۆ کۆمەلێك خـــەلك ئەووترێ . گێرانەوەیە ـ ئەویش کۆمەلێك خەلك پشتاوپشت بۆ یـــەکتری ئەگێڕنەوە .

گەر ( بەکۆمەڵی ) ، شەقڵێکی تایبەتی‌ی فۆلکلۆر بێت ــ تــــەواو
ئەم بە کۆمەڵی‌یە لە گۆرانی‌ی ئیش‌کردنا زۆر باش دیارە ، بە تایبەتی لە
فۆلکلۆری کورددا ــ تا ئێستا جۆرە گۆرانی‌یەکی کە مابێت‌و لـــە
کاتی ئیش کردنا باوبێت ئەوە گورانی‌ی دروێنەکردنە ، دروێنەی بـــە
کۆمەڵ . بەرامبەر بەمەش هەر لە مـــەیدانی ئیش‌کردنا گـــۆرانی‌ی
واشمان زۆرە کە تاقەکەس ئەیلێت ، بەڵکو گۆرانی‌ی شـــــوان ،
تاقەکەس ئەیلێت . بەڵام چ بۆ ئەمیش‌و چ بۆ هەندێ گۆرانی‌ی تری
تاقە کەسی‌تری ئیش‌کردن ، ئەتوانین بڵێین : شوان گۆرانی‌یەکەی
هەر بۆ خۆی نی‌یە ، بەڵکو هەست‌و دەروونی دەوروپشتی ، تەنانەت
دوانەکەی لەگەڵ ئاژەڵدا ئەچێتە ناو تێکستی گۆرانی‌یەکـــــەوە .
ڕەنگە ئەو بەرەیەش کە لەسەر ئەو باوەڕەن کەوا گۆرانی‌ی ئاینی لـــە
گۆرانی‌ی ئیش‌کردن کۆنترە ، بڵێن : زۆر گۆرانی‌ی ئاینیش شـــەقڵی
بەکۆمەڵ ووتنی پێوەیەو هـــەر زادەو بەرهەمی کـــونج‌و بورجی
خواپەرستی نی‌یە .
ئەمەیان شتێکی زۆر تایبەتی‌یەو ئەبێ بۆی بچینەوە سەرتەرزی
خواپەرستی لە هـــــەموو ئاینێکداو بەڵکو لە هـــەر مەزهەب‌و
تەریقەتێکیشدا . هەروەك ئەبێ گۆرانی‌یە ئاینی‌یەکە تەواو لەگـــەڵ
جۆری مەبەس‌و خواپەرستی‌یەکەدا بەراورد بکرێ .
گۆرانی‌ی ئیش‌کردن ، ووشەو ئاوازو دەنگ‌و پارچـــەی ،
زۆرتر لەگەڵ بزوتنەوەی لەش‌و ئەندامەکانی لەشدا یەك‌ئەگرێ . لـــە
کاتی ئەو ئیشەدا کە گۆرانی‌یەکەی پێوە ئەووترێ‌و لە کاتی هـــەندێ
ئیشی‌گراندا ، ، دەنگ‌و هاوارەکانی ئیش‌کردن یاریدەی لەش‌ئەدەن‌و
باری سووك‌ئەکەن .
ڕەنگە ئەوی گۆرانی‌ی ئاینی بە کۆنتر ئەزانێ بڵێت : زۆرجـــار
گـــۆرانی‌ی ئاینی ، هەر دەنگ بەرزکردنـــەوە نی‌یە ، بـــەڵکو
لەش جووڵاندنەوەشە ، ئێستاش بچیتە هـــــەر تەکیەو خانەقایەکی

کوردستان ، ئەم ڕاستی‌یەت بۆ دەرئەکەوێ ، بەلاّم گۆرانی یا هۆرەی دەرویش ( ئەوی ئێستا نەك کۆن ) ، بزووتنەوەکەی تەواو یارمەتی‌ی ووشەی گۆرانی‌یەکە ئەدا ، بە پێچەوانەی گۆرانی‌ی ئیش کردنەوە ؛ واتە لێرەدا جوولاّندنەوەی لەش ، زادەی ووشـەو بیرە ، لەوێدا ، ووشەو بیر زادەی ئیش‌کردن‌و لەش‌جوولاّندنەوەیە •

گۆرانی‌ی ئیش‌کردن لە سەرەتادا ووشەو مۆسیقای لەیەك جیا نەبوون • هەندێ جار فەرمان‌و داواکردنی دەرئەخست ، پاشـان کەوتنە دەرخستنی بیرو هەستی ئالوزترو گراتر ، کە پێـوەندی‌یان بەم یا ئەو جۆری کارەوەو بـە زروفی کۆمەلاّیەتی‌ی خەلکـەوە هەبێت •

گۆرانی‌یەك کە پێوەندیی بە ئیشەوە هـەبێت ، تەنانەت لـە ڕۆژانی ئەمڕۆشدا ، بە پێ‌ی جۆری کۆمەڵ ئەگۆڕرێ‌و سروشتی ئەو کۆمەڵەی کە هەیە ، لە هەندێ وولاّتا هێشتا هەر گۆرانی‌ی شـوان‌و دروێنەو کۆلکێشانە • ئاوێنەی ئارەق ڕشتن‌و دەردو ئازارە • لـە هەندێ وولاّتا گۆرانی‌ی کرێکارە ، بەسەر ئیشی ئازادا ، بەسـەر شاری نوێ دروست‌کردنا • بەلاّم زۆری ئەم گۆرانی‌یانە ، ئـەمڕۆ ، لە کۆڕی فۆلکلۆر ئەچنە دەرەوە ، چونکە دانەری هۆنراو و ئاوازی دیارن •

پاش گۆرانی ئیش‌کردن ، ئەو گۆرانی‌یانە دێن کـە پێوەندی‌یان بە ڕەوشت‌و عادەتەوە هەیە ، یا بە بۆنەو موناسەبەتەوە ئـەووترێن • گۆرانیش هەیە کە لـە زەمانێکی کۆنەوە پەیدابووە ، ئەمانـە پێوەندی‌یان لەگەڵ یاری‌کردن‌و هەلپەڕکێدا هەیەو بەو بۆنەیـەوە ئەووترێ کە گۆرانی‌یەکەی لێوە پەیدابووە • بۆیـە لێرەدا لیریك‌و دراماو بە کۆمەڵ گۆرانی ووتن ، هەرسێکی یەك‌ئەگرێ •

بە پێ‌ی جیاوازیی ( بۆنە)و پەیڕەو ، هەر لە زۆر کۆنەوە ، بـە تایبەتی لە جەژنەکانی کۆنەوە ، کۆمەلە گۆرانی‌یەك لەلای هـەموو

گەلان هاتوتەکایەوە ، هەندێکی گۆرانیی جەژنی منداڵبوونە ، کە لای خۆمان گۆرانیی ئێشك گرتنی پێ ئەڵێن . یا گۆرانیی بەهارە ، کە لەلای زۆر لە گەلان لە ڕۆژی نەورۆزا ، لە سەرەتای بەهارا ئەووترێ ، یا گۆرانیی شاییو ژنهێنانە .

جۆرێکی تری گۆرانی ئەوەیە کە ڕەوشتو عادەتو ڕووداوی ژیانی گەل لە هەموو ڕوویەکەوە ئەخەنە بەرچاو . پێوەندیی ناوخێزان ، باری کۆمەڵایەتیی دەستە جیاجیاکانی گەل ، دۆستایەتیو خۆشەویستی ، ئەمانە هەموو گۆرانیی ڕووداوی پێ ئەڵێن . وە بە پێی ئەم تێم ( اصطلاح )ە ، گۆرانیی ئیش کردن لە گۆرانیی ناو خێزانو ڕەوشتو عادەتو یاریو دلداریو شاییو لاوانەوەو لای لایەو گەلێك جۆری تر جیائەکرێتەوە . لە ڕووی فۆرمەوە ئەم گۆرانیو ئاوازانە گەلێك شێوەو جۆریان هەیەو لای هەر میللەتە ئەم جۆرانە جیان . ئەوەی کە تیۆریی ئەدەبی جیهان باسی ئەکاتو لەم بارەیەوە پێوەندیی بە فۆلکلۆری کوردی یەوە هەیە ، پێش هەموو شت ، گۆرانی یە .

گۆرانی هۆنراوەی بچووكو کورتەو لە ڕووی ژانرەوە بەشێکە لە لیریك ، وە زۆرتر ، بە تایبەتی لای گەلانی پێشکەوتوو ، بە بێ مۆسیقا یا پیانۆ ناووترێ .

بیلینیسکی گۆرانی بە « لیریکی پوختە » ناوئەبات[٢] ، لە ڕاستیشدا ، لە هۆنراوی ئاسایی لیریکدا ، زۆرجار وێنەی تایبەتیو فۆرمی دیالۆگ ئەبینین . ئەم فۆرمانە بۆیە کەوتوونەتە ناو گۆرانی یەوە ، چونکە ئەم هۆنراوی لیریکە لە خۆیدا بۆ گۆرانی دروستبووە .

پەندێکی ڕووسی هەیە ئەڵێ « گۆرانی هاوتای جوانی یە » یا ئەڵێ « لە گۆرانیدا ووشە نە لائەدرێ ، نە فڕێ ئەدرێ » . سروشتی گۆرانی ، قووڵیو ڕاستی یە ، لە کانی دڵەوە هەڵقوڵانە ، هەست

چوولانە ، ساكاریو شتدەرخستنە • نەك تەنیا لـــە فۆلكلۆردا ، تەنانەت لەو گۆرانییانەشدا كە شاعیران ئەیانتوسن ، گەر سادەییو هەست دەربڕین هەبێت • ئەبینین كە زوو بلاوئەبنەوە • چونكـــە سادەیییەكەو ئەو هەستەی كە دەربڕراوە ، لە دەروونی خەڵكدان •

هەموو نەتەوەیەك گۆرانیی خۆی هەیەو گـەل لە ڕاستییا خۆی خولقێنەری • بلیمەتی ، بەشی زۆری گۆرانییـە • گۆرانی لە شێوەی جیـاوازدا لای زۆر گەلانی جیهـــان بلاوە • گۆرانی ئاوێنەی گیانی میللەتو گەنجو بیرو ئامانجییەتی • هەمیشە بـــە قووڵیی هەستو عاتیفەو لیریك ، خۆی لە بەشی تری بەرهـــەمی ئەدەبی جیائەكاتەوەو تەنیا ئاوێنەی هەستی تایبەتیی دانەرەكــــەی نییە ، بەڵكو هەستی فراوانترین كۆمەڵی خەڵك دەرئەبڕێ •

لە رووی سوژێت ( موضوع ، باس )ەوە چـەند ڕەگەزێكی تایبەتی ئەبێتە خاسیەتی گۆرانیی ناوخەڵكو بەرهـــەمی خەڵك • بەلام سوژێت لەم گۆرانییانەدا هەمیشە سادەیـــەو ئاڵۆز نییەو باسی عاتیفەو هەستەو بە زمانێكی سادەش نووسراوە ، بـەلام زۆر ئاسكەو ئێجگار جوانو پڕ وێنەیەو ئەبێتە نـــــوونەی جوانی • گۆرانی • لە ناو ژانرەكانی ئەدەبی فۆلكلۆردا جێگـەیەكی گرنگی هەیە • هاوشانی ئادەمیزادەو لە بێشكەوە تا ژێرخاك ، هـــاورێیی ژیانییەتی • هاوبەشی ئیشكردنی ئادەمیزادە ، شیرینكەری جەژنو شاییە ، وەك تنۆكی شادی ، لە كاتی حەســــانەوەدا ، زاخاوی مێشك ئەداتەوە ، گۆرانی هاودەمی ئافرەتانو شـــایی ناوخێزانو جوانیی بەیانو خۆرئاواو ئێوارانە •

خاسیەتی گۆرانیی ناو میللەت ، لە ڕووی باسەوە ئەوەیە كە لە شتی جیاجیا ئەدوێو پڕە لە هەستو نەستو خـواستی قووڵو دەولەمەند ، لەو گۆرانییانەدا هەڵچوونی ئازایانەو ســـۆزی دڵ ئەبیسترێ ، بەلام لە هەموو جارو حاڵێكدا بنەڕەتی جەوهەریی ئەم

گۆرانی‌یانه دەربڕینی هێزو تواناو خۆشی‌ی ژیانه •

له سەدەی پێشوودا ، ئوسپێنسکی نووسیوی‌یه : « ماتەم ، خواست ، سۆز ، سەرما ، برسێتی ، فرمێسك ، بەدی ، تەم ، ئەمانه دێن‌و دەچن ، بەڵام ئەوەتا ئەو بەرهەمه ڕەنگینه ، نەمره ، ئەو دەنگه نەگۆڕراوانه ، هەر له جێی خۆیانن ، ئەمانه ناگۆڕێن ، وەك دەنگی بولبول ، گۆرانی‌ی خەڵکیش تەنیا لەو هێزانەی ژیان ئەدوێن که ناکوژێنەوه ، کۆتایی‌یان نایەت ، هەر ئەوه ئەخەنەوەیاد که ئەبێ به خۆشی‌و شادی بژیت ، ئەو دەنگەی که گۆڕرانی بۆ نی‌یه ، هەمیشه هەر دەنگ‌ئەداتەوەو پیرنابێت »[٣] •

بیلینسکی‌و گۆگۆل گۆرانی‌یان به مێژووی گەل ناوبردوه ، ناویان‌ناوه « زەنگی دەوران »و وێنەی زیندوو و دیارو ڕەنگینی ڕاستی[٤] •

مێژووی گۆرانی‌ی خەڵکی ، له زۆر کۆنەوه دەست‌پێ‌ئەکات• ئەو مێژووه چیرۆکی ساڵانی زۆر دووری بۆ پاراستووین‌و لەو گۆرانی‌یانەدا یادی ڕووداو و باسی شەڕەکانی زوو ئەبینین • ئەو گۆرانی‌یانەی دەربارەی شەڕەکانی کۆنن ، زۆرتر ڕاستەو ڕاست پێوەندی‌یان به ڕووداوی مێژوویی‌یەوه هەیه • بەڵام لەگەڵ بەرەوپێش هاتنی مێژوودا ئەبینین ، که کەرەسەی گۆرانی ئەگۆڕێ • له ئەوروپادا هەر لەگەڵ پەیدابوون‌و پەرەسەندنی پیشەسازیدا ، ئەبینین له پاڵ یا له جێگەی ئەو گۆرانی‌ی شوان‌و دروێنەیەی جاراندا ، گۆرانی‌ی کرێکارو ناو کارگه پەیدابوو • له سەرەتادا ئەم گۆرانی‌یانه هێشتا هەر ڕەگەزو وێنەی لادێ‌و ناو جوتیاری هەر تێدابوو ، چونکه ئەو کرێکارانەی له سەرەتای پیشەسازی‌یەوه ڕوویان کردبووه کارگەوشار ، له دێهاتەوه هاتبوون ، بەڵام ورده ورده ڕوخساری ئەم گۆرانی‌یانه گۆڕرا •

وەك ووتمان ، گۆرانی شێوەیەکی کۆنی فۆلکلۆره ، بەڵام

لەگەڵ پەیدابوونی نووسینو خوێندەواریدا ، لەناو زۆر میللـەتدا ، وردە وردە گۆرانیی نووسراو پەیدائەبێت ، کە دانەرەکەی دیارە• ئەم گۆرانییانەش لە زۆر خاسیەتدا ، لە ڕووی فۆرمو ناوەڕۆکەوە لە گۆرانیی خەڵك زۆر جیانین • تەنیا ئەوەیە کە چاپەمـەنی ناوی خاوەنەکانیان ئەهێڵێتـــەوە • بەڵام لەم دەورەشدا گـــۆرانیی ناوخەڵكو فۆلکلۆری هەر ئەمێنێتەوە ، وە وا دیـارە تا زەمانێکی زۆر دووریش هەر ئەمێنێو ڕەنگە نەمانی بۆ نـــەبێت • گۆرانی لەگەڵ ئیش‌کردنی ئادەمیزادا پەیدابوو ، ڕەنگە تا ئیش بمێنێ هــەر بزرنگێتەوە •

لە ئەوروپادا ، لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەستەیەك لە شـاعیرە باشەکان ، لەسەر بنەڕەتی گـــۆرانیی خەڵکی دەستیان دایــە گۆرانی‌نووسین • ئــەمانە زۆرباش شارەزای فۆلکلۆرو ئــەو گۆرانییانەبوون کە بەسـەر زمانی خەڵکییەوەبوون •

بناغەدانەرو سەرئامەدی ئەم ژانرە ئەدەبییە ، لە ســـــەدەی پێشوودا ، ( پوشکین )ی شاعیری ڕووسە • کە هەندێ شــیعری وای نووسیوە کە لە ژیانو شیعری خەڵکەوە نزیکە • هــەندێ لەم شیعرانە ، هەر لەخۆیانەوە ، وردە وردە لەناوخەڵکدا بوون بــە گۆرانی ، هەروەك کارێکی گەورەیان کردەسەر گۆرانیی خـەڵك خۆی • زۆر لە هۆنراوەکانی پوشکین خۆی ، چوونە ڕیزو لیستەی گۆرانیی خەڵکەوە • هەروەها لە سەدەی پێشوودا ، لێرمانتۆڤو گەلێك شاعیری‌تر ، بــــە شیعرەکانیان ، کاریان کردۆتە ســـەر گۆرانیی خەڵك • بە تایبەتی ئەوی لەبابـــەت ژیانو ڕووداو و ئیشو کێشەی کۆمەڵایەتییەوە نووسیویانە ، لەسەرخۆ چـوونەتە ناو گۆرانییەکانی میللەتەوە(٥) •

لە گۆرانیی کوردیدا زۆر شەقڵی گـۆرانیی ئاینیو ئیش‌کردن هەیە ، کـــە دیارنو یەکن ، بە تایبەتی بەکۆمـــەڵ ووتنی ئـــەو

گۆرانی‌یانەو پێوەندی‌یان لەگەڵ جوولانەوەدا . ساغ کردنەوەی ئەوەی کە گۆرانیی ئاینی لە کوردیدا کۆنترە یا گۆرانیی ئیش‌کردن ، با باوەڕێکی بەتینیشمان لە ڕووی فەلسەفەوە بە یەکێکیان هەبێت ، هەوڵو تەقەلاو کۆششی عیلمیی هەرئەوێ .

زانای ناسراوی کورد جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی دەربارەی ناوی گۆرانیی کوردی ، ڕایەکی‌هەیە کە ئەڵێ :

« ... ڕەنگە ناوی هەندێ لە گۆرانی‌یەکانی کوردی زۆر کۆن‌بن ، بۆ وێنە ، ( قەتار ) ڕەنگە لە ووشەی ( گاتا )وە گۆڕابێ . وە لە کاتی خۆیا هەر گاتای پێ‌ووترابێ . هەروا ( هۆرە ) ، ڕەنگە گۆرانی‌یەکی تایبەتی بووبێت بۆ ستایشی ( ئاهورامازدا ) ... هەروەها ( کەڵهوڕی ) ڕەنگە ( کەڵە ئاهوڕایی ) واتە لە گۆرانی‌یە هەلبژاردەکانی باسی ئاهوڕا بووبێت . جگە لەوە گۆرانیی ( خورشیدی ) تا ئیستا گەواهە کە لە کاتی هەلاتنی خۆرداووتراوە، بە ناوی نیازەوە ، چونکە دەبینین بەرامبەر بەوە ، گۆرانیی ( خاوکەر )مان هەیە کە بۆ خەوهێنان ووتراوە »[٦] .

ئەم ڕا وردە ، لێ‌کۆڵینەوەو لێ‌دواندنێکی قوولی ئەوێ ، زۆر بەجێ‌یە کە ( قەتار ) لە گاتای زەردەشتەوە یا لە ئاڤێستاوە هاتبێ ، بەلام دوور نی‌یە ( قەتار ) هەر لە ووشەی ( قەتار )ی عەرەبی‌یەوە هاتبێ ، کە بە مانای کاروان بەکار ئەهێنرێ . بەڵگەش بۆ ئەمە ، ئەوەیە کە زۆر جار لە مەقامی قەتاردا گۆرانی‌بێژ ئەڵێ « قەتارێ بێنن غەمانم بارکەن » ، یا بەم مەقامەوە جۆرە هۆنراوێك ئەووترێ ، کە مانای ڕاستەقینە یا مەجازیی گەشتو ڕۆیشتن‌و کاروانی تیابێت . وەك ئەم دوو فەردەی مەولەوی :

ئازیز دیارەن ، وادەی ئواەمەن ئەلوەداع ئاخر ، ئەوەد ناعامەن
دەولەتەکەی وەسڵ پا نە زەوالەن
جا ڕێو تەر دیدەن بالات مەحالەن[٧]

هۆرەش زۆر بەجێیە کە یەکێ بێت لە گۆرانی یە تایبەتی یەکانی (ئاهورەمازدا) .. یا هیچ نەبێ سەرچاوەکـــەی یەکێك بێت لە گۆرانی یە ئاینی یەکان . چونکە ئەبینی ئێستاش (هۆرە)، هـــەر تەنیا هۆرەی دەروێش لەناو کورددا لەمانە هەموو بەناوبانگترە، وە دوور نی یە (هۆرەو ئاهووراو هاوار) لە ڕووی ووشـــە یا زمانەوە، لەیەك سەرچاوەوە هاتبن، وە ئەم ووشەو مانایە تەواو لە ووشەیەکی زمانێکی تری هیندۆ ئۆروپی یەوە نزیکە کە ئەویش ووشـــەی (هورا)ی ڕووسی یە کە بە مانای هاوار یا بلێین ــ بانگ یا هتاف ــ بەکاردێتو نزیکی ئەو مانا کوردی یانەیە .

ڕۆژبەیانی، مـــەقامی خورشیدی ــ بە مـــەقامی کاتی خۆرهەڵاتن دائەنێ، بەڵام مەقامزانی بەناوبانگ عەلی مەردان[٨] . ئەم مەقامە بە گۆرانی ی کاتی خۆرنشین ئەزانێ، هـــەرچۆنێك بێت هەر بەستراوە بە خۆرەوە، جا خۆرهەڵات بێت یا خۆرنشین .

گەر لەسەر لێکدانەوەکەی ڕۆژبـــەیانی بڕۆینو گۆرانی ی کوردی هەمووی بەرینەوە سەر سەرچاوەیەکی ئاینی، ئەوا ئـــەم مەقامی (خورشیدی)یەش ئەبەینەوەسەر سەردەمێکی زۆر کۆن، ئەیبەینەوەسەر ئەو کاتەی کە ڕۆژ جێگەو مانایەکی تایبەتی ی لـــە باوەڕی کورددا هەبووە . بەڵام ئەتوانین هـــەڵهاتنو ئاوابوونی ڕۆژیش بە ئیش کردنەوە ببەستین . هەروەك ئـــەتوانین (هۆرە)ش بکەین بە هاواری کاتی ئیش کردن . مەقامی (خاوکەر)یش دیسان ئەبرێتەوە سەر هەردوو سەرچاوەکەی گۆرانی .

فۆرمو ناوەڕۆکی گۆرانی ی کوردی : لە ڕووی ئەدەبیاتـــەوە

(موسیقا نا) ئەتوانین گۆرانی ی فۆلکلۆر بە جۆرە شتێکی جیـــا لە بەیتو داستان دابنێین .

گۆرانی بریتی یە لە تاقە دێڕێك ــ یا بەیتێك هۆنراو ــ واتـــە

هەر بەیتە هۆنراوە لە گۆرانی‌یەکدا ، تابلۆیەکی جیاوازەو مانایەکی تەواوی خۆی هەیەو بە بەیتی دووەمی گۆرانی‌یەکەوە نەبەستراوە ــ وەك ئەڵێ :

**ئەترسم بمرم تۆ نەبینمەوە          بە جوانەمەرگی سەربنێمەوە**(۹)

هەروەها هەندێجار گۆرانی یا تاقەی هۆنراو لــە گۆرانی‌دا بریتی‌یە لە سێ نیو دێری ، وەك ئەڵێ :

**چەند خۆشە بەزمی ئێواران          گاڵتەو سوحبەت لەگەڵ یاران**
**لەناو باغچەکەی هەزاران**(۱۰)

هەندێجار گۆرانی بە دوو بەیت تەواوئەبێ • ئیتر یا لــــە شێوەی چوارخشتەکی‌دا ، واتە بەیتی یەکەم‌و دووەم‌و چــوارەم قافیەیان لەیەك ئەچێت‌و دێری سێ‌یەمی سەربەستە ، وەك ئەڵێ :

**هەنار هـــەنار هـــەنارە          دەردو دەرمـــانم یارە**
**ئەم جەژنەم بەبێ‌تۆکرد          تاڵە وەك ژەهری مارە**(۱۱)

یاخود چوارخشتەکی نی‌یە ، لە رووی قافیەوە دوو بـــەیتی جیاوازە بەڵام بەیەکەوە مانایان تەواو ئابێت ــ وەك ئەڵێ :

**نامە ئەنووسم بە خوێنی دڵم          ئەیدەم بە شەماڵ بیبا بۆ گوڵم**
**ئایدەم بە شەماڵ پێچویەنایە          بۆ خێرم بۆی دەبەم داخم لەدڵایە**(۱۲)

ئەو باسانەی تا ئێستا لەسەر فۆلکلۆری کوردی نووســـراون ، گۆرانی‌ی بۆنە ( مناسبات )و ئیش‌کردنیان باش لەیەك جیــاکردۆتەوە وەك : گۆرانی شوان ، گۆرانی‌ی جوتیار ( بە هەموو چـــەشنی‌یەوە ) کە لە خۆیدا ــ بە ووشەو زمانی گۆرانی‌یەوە کەرەســەیــەکی باشە بۆ ساغ‌کردنەوەی سەرەتای دەست بە کشتوکاڵ‌کردن لە کوردستانا •

هەروەها گۆرانی‌ی شایی‌و هەڵپەرکێ‌و ئێشـــك‌گرتنی منداڵ هەیە • گۆرانی‌ی دیلانێ‌و یاری‌کردنی منداڵیش ئەچێتە سەرئەمیان • هەروەك گەلێ چەشنی‌تریش هەیە ، هـــەندێکیان ئەچنەوە ســـەر گۆرانی‌ی ئیش‌کردن ، نەك ( بۆنە ) ، وەك گۆرانی ئافرەتان لــەکاتی ئیشدا ( کۆڵ‌کێشان‌و مانگادۆشین‌و مەشکەژەنن ) ، کــە ئـــەمیش

که‌ره‌سه‌یه‌کی باشه بۆ لێکۆڵینه‌وه‌ی ئه‌وه‌ی که ئافره‌تی کورد که‌ی ده‌ستی داوه‌ته ئیش‌کردن ، یا له کۆمه‌ڵی کورده‌واریدا که‌ی ده‌وری ده‌سه‌ڵاتداری‌و سه‌رده‌ خێڵی‌ی ئافره‌ت بووه(۱۳) .

گۆرانی‌ی کوردی هه‌رچه‌نده ساده‌یه‌و ووشه‌کانی ته‌واو له‌قسه‌ی ساده‌ی ناو خه‌ڵکه‌وه وه‌رگیراوه . به‌ڵام له ڕووی جوانی‌کاری‌و ڕازاندنه‌وه‌و به‌لاغه‌ته‌وه ، پڕه له (ته‌شبیه)ی جوان جوان که له ئه‌ده‌بی کلاسیکی‌ی سه‌ده‌ی نۆزده‌یه‌ممان‌دا ڕێکخراو تری ئه‌بینین . وێنه‌ی باڵا به « شمشاڵ‌و چنارو لاولاو » ته‌شبیه‌ئه‌کرێ ، دان به مرواری ، قژ به تاریکی‌ی شه‌و ، برۆ و برژانگ به تیرو که‌وان .

گۆرانی‌ی فۆلکلۆری کوردی وێنه‌یه‌کی سروشتی ووڵاته‌که‌شمانمان پیشان‌ئه‌دات . خوڕه‌ی ئاو ، چڕی دارستان ، بارانی به‌هار . کانی‌و ئاو و ڕووبارو سه‌رچاوه ، کێوه‌به‌رزه‌کان‌و ناوی ئه‌م کێو و ئه‌و کێو . گوڵی کێوی : به‌ره‌زا ، داربه‌ڕوو ، ڕه‌شه‌ڕێحانه ، گوڵی هه‌نار ، داره‌به‌ن‌و جۆر جۆر دیمه‌نی‌تری سروشتی ووڵات له گۆرانی‌ی کوردیدا ئه‌چریکێن‌و سه‌رهه‌ڵئه‌ده‌ن‌و خۆیان ئه‌نوێنن :

**ئه‌م به‌رم شاخه ، ئه‌و به‌رم شاخه**
**کراست بۆ ئه‌که‌م له گوڵی ئه‌وباخه(۱٤)**

گۆرانی‌ی کوردی گه‌نجینه‌یه‌کی شوێنه‌وارو شوێن‌هه‌واری عه‌شق‌و عاشقانه . زیندوکه‌ره‌وه‌و ناوهێڵه‌ره‌وه‌ی گوندو شارو شوێنانی ووڵاته‌له‌هه‌موو گۆرانی‌یه‌که‌دا ناوی چه‌ند جێگه‌و شوێنێك جێگیر ئه‌کرێت . هه‌ر له « پێستوون »ی مه‌نزڵگای فه‌رهاده‌وه تا زرێباری له‌گۆمدا نقوم‌بوو ، تا کانی‌ساناێ له مه‌ڵبه‌ندی ئه‌رده‌ڵان‌و مه‌ریوانه‌وه تا قه‌ڵاچوالانی قه‌ڵای سه‌ختی بابان . ئه‌مانه هه‌موو له گۆرانی‌ی کوردی‌یا شریت‌و وێنه‌یه‌ك ئه‌خه‌نه به‌رچاو و دیمه‌نێکی ڕابوردوو ئه‌گێڕنه‌وه ، هه‌ر شاره ، یا گونده ، له هه‌ر گۆرانی‌یه‌دا نیشانه‌ی شتێکه . با سه‌یرێکی ئه‌م دوو به‌یته بکه‌ین ،

که دیمەنێکی ڕابوردوو ، سەربەخۆیی ، شارستانێتی‌ی کۆن ئەگێڕێتەوە •

**سالێ بەو تەیام زرێبار شار بوو**
**سێ‌سەد دەروازەو چوارسەد منار بوو**
**زرێبار چۆن لە کانی‌سانان**
**کوا خان ئەحمەو خان ، باشی کولخانان**[١٥]

لە شوێنی‌تردا ئەبینین ، شارەزوور بێت ، یا سەقز ، یا بانە ، یا عەبابەیلی‌و پێنجوین بێت ، ئەوە بەندێکی دڵداری ئەگێڕنەوە •

**دەشتی مەریوان کاکی بەکانی**
**دوورێ لە بالاکەت وێرانبێ خاکی**[١٦]

لە شوێنێکی‌تردا ئەو مەڵبەندی خۆشەویستی‌و ئەڤینە ئەبێتەوە نیشتمانە خۆشەویستەکەو لە قووڵایی دڵێکی سافی بێ گەردەوە خۆشەویستی‌ی بەرامبەر دەرئەبڕێ :

**خۆشە سلیمانی خاکی دڵگیرە**
**ئەوی لێ‌ی دووربێ حەوت سال یەخسیرە**[١٧]

یاخود ئەڵێ :

**تۆ لە سلیمانی بە کراسی حەوت ڕەنگ**
**منیش لە تاران غەریبو دڵتەنگ**[١٨]

جوانترین‌و بەسۆزترین وێنەی خۆشەویستی‌ی نیشتمان لەو گۆرانی‌یە کوردی‌یانەدایە کە باسی غەریبی ئەکات ، نزیکەی هەزارو چوارسەد ساڵە هەموو موسوڵمانێك فەرموودەی پیغەمبەر ئەگێڕێتەوە کە خۆشەویستی‌ی نیشتمان لە ئیمانەوەیە ، بەڵام هەر بە ووشەی سادەو ساکاری کوردی ئەو مانایە لە گۆرانی‌ی کوردی‌یا ئەبینین ، کە زۆر بە قووڵی ئەڵی :

**هەرکەس کە بیوشەت غەریبی خاسە**
**ئەویش لە جوملەی خودا نەشوناسە**[١٩]

واتە : خۆشەویستی‌ی نیشتمان‌و باوەڕو خواپەرستی ، هەمووی لەلای ئەو کوردە خواپەرستە سادەیە ، چەند ووشەیەکن لە قووڵایی

دڵو هەستو مێشکدا بەرامبەر بە یەك ئەوەستن .

گۆرانیی غەریبیو دووری نیشتمان گەلێك تابلۆ و وێنەی قووڵی تیایە ، تەواو دیمەنی فراوانی هەستی ئادەمیزادو مرۆڤایەتی دێنێتـــە بەرچاو ، وەك لەم دێرەدا ئەبینین کە ئەڵێ :

**ئەترســـم بمرم لـــەم دوور وولاتـــــە**
**دڵ پڕ لە خـــۆزگەو ئاخو ئاواتـــــە[٢٠]**

واتە ئادەمیزاد ، هەستی ، خواستو ئاواتی دەروونی ، هیـــوای ڕوناکی دوارۆژی ، هەموو لە غەریبیدا ئەمرێ .

**غـــەریبی شاران هـــەر بۆ من خاســـە**
**کراســـــم غەمـــــە ، بەرگم پەلاســـە[٢١]**

نیشتمان پەروەر لە غەریبیدا هیچ جوانیو خۆشییەك بەدی ناکات ، نە لە دەرووناو نە لە ڕوخساردا .

**غـــەریبی شـــاران بـــەچی یا دیـــارە**
**ڕەنگی یـــان زەردەو لێـــویان بـــەبارە[٢٢]**

گۆرانیی کوردی لەپاڵ ئەم دیمەنانەدا کەرەسەیەکی جوانو باشە بۆ لێکۆڵینەوەی ژیانی کۆمەڵایەتیی کورد ، پێوەندیی ناوخێزان ، بەرەوپێشچوونو گۆڕانی ڕەوشتو خـــــوو ، کچ بەشوودان . لێکۆڵینەوەی ئەمانە بەپێی ســـاغ کردنەوەی کاتو شـــوێنی گۆرانییەکەو بە پێی زاراوەو چەشنی زمانەکەی ئەبێ :

**خـــوای بانی ســـەر زۆردار بکـەی کوێر**
**دۆســـــتم ناشـــــی بی بردنی وە زۆر[٢٣]**

یاخود ئەڵێ :

**ئەگـــەر نەبوایە بـــە لۆمـــەی وولات**
**کەپریکم دەبەست شـــەو و ڕۆژ لەلات[٢٤]**

هەروەك گۆرانیی کوردی کەرەسەش ئەدات بـــە دەستەوە بۆ ساغ کردنەوەی لێکۆڵینەوەی هەندێشت کە خۆیان لە خـــۆیاندا فۆلکلۆرنو دیمەنی ژیانی کۆمەڵایەتیش لە پلەیەکی ژیاندا دەرئەخەن . بۆ نموونە ئەتوانین بە دوای باسی ( گۆزە ) و ( ڕێگـــەی کانی )و

( گلێنە )و ( چیغ )و ( کاسەو کەوچك )دا بگەڕێین لەم گۆرانییانەدا •
هەروەها گۆرانیی کوردی وەك هەندێ لە داستانو بەیتەکان دیمەنی جلوبەرگی ( سەردەم )ی خوێ نەخشـــــەئەکێشێ • باسی ( شەدە )و ( کڵاو )و ( پشتێنو دەسماڵو ڕانکوچۆغەو ستارخانیو مرادخانیو شاڵوشەپك ) لە گۆرانیی کوردیدا ئێستا دیمـــەنێك ئەهێنێتە بەرچاو کە هێشتا هەر ماوەو لەبەرچاوماندایە ، بەڵام ڕۆژێك ئەبێ لە ڕێگەی فۆلکلۆرەوە بە دوایاتا بگەڕێنو نەخشــــەیان بۆ بکێشــــن •
گۆرانیی کوردی خۆی وێنەو ئاوێنەی هەستو عاتیفەیـــــەو چونکە شێوەی دەربڕینی ئەم هەستـــەش سادەو بێپێـــچو پەناو ڕاستەوخۆیە ، بۆیە لە گۆرانیی دڵداریو عەشقو ئـەڤینی کوردییا ڕاستگۆییو وێنەی ڕاستی بەدیئەکەین • بەڵکو وێنەیەکی قووڵی لە دەروونی سووتاو و بەسۆزو پاكو دڵسۆزەوە هەڵقوڵاو ئەبینین ، گەر بمانەوێ بە قووڵی لەم باسە بدوێین ، تاقە دێڕێکی فۆلکلۆری کوردی هەیە ، کە لە قووڵیی عاتیفەو ڕاستگۆیی وێنەدا ساکارە ، بـەڵام زۆر ڕەنگین.وەك تابلۆیەکی لەشدار دێتە پێشچاوو ئەبێتە بەڵگەی قسە :

**بنووســـــن لەســـــەر کێلی مـــــەزارم**
**شەهیدی عــــەشقم مـــــەدەن ئازارم**(٢٥)

ڕەنگە ئەمە اوتکەی هەستو عاتیفەو خۆبەختکردن بێت لـــە پێناوی خۆشەویستیدا ، بەڵام لەم وێنەیە لە گۆرانیی کوردیدا زۆرە :

**ئەڕۆژگەم لەم دنیـــا تۆیان بایــــە پێـــم**
**چش ! با لەو دنیــــا دۆزەخ بڕایە جێم**(٢٦)

ئەمەشیان شایانی لێكدانەوەو خستنە بەرچاوی هەموو سەر ، یا بە ئیستلاحی تازەی ئەدەب ، شایانی خستنە بـەرچاوی پانیو درێژیو بەرزیی ، تابلۆکەیە • بەڵام هەر لەم بارەبەوە وێنەی تریشـــــمان وا لەبەرچاو • لە دیمەنی خۆبەختکردنا ئەم دێڕە نموونەیە :

**شـەرتبێ لـــە داخت تەركی دنیاكـــەم**
**عـــەسا هەڵگرم ، كەشـكۆڵ پەیداكەم**

لێرەشدا ، تەركی دنیاكردن‌و عەساهەڵگرتن‌و كەشكۆڵ پـــەیدا كردن ، هەر یەكە دیمەن‌و وێنەیەكن ، هەر یەكە وێنـــەی چیرۆكێكن ، بە سادەیی بڵێین چیرۆكێكی لەیل‌و مەجنوون‌و ئەسڵی‌و كـــەرەم‌و شیرین‌و فەرهادو شەم‌و وەلی‌دێوانە خستنە بەرچاون . ئـــەم دێڕەی تریش وێنەیەكی دڵسۆزی پیشاندانە .

**ئەگـــەر گەڕەكتـــە دڵەكەم دەربێنـــم**
**لـــە جێی هـــەڵو گوڵ بۆتی بنێـــم[٢٨]**

لە لووتكەی ئەم وێنەو تابلۆیانـــەی دڵسوزی‌داو لە دیمـــەنی ڕاستگۆیی عاتیفەدا ئەم دێڕەش هەیە :

**شـــەرت بێ گوڵی كەس نەكـــەم بە بۆوە**
**تا گـــوڵم بۆ دێ لـــە خزمـــەت تۆوە[٢٩]**

لە دێڕێكی‌تری گۆرانی‌دا ، هەر تەنیا سۆزو عاتیفـــەو ئاوات‌و دڵ سۆزی دیار نی‌یە ، بەڵكو وێنەیەكی لەشداڕو تابلۆیەك ئەبینین كـــە جووڵانەوەو نە وەستان‌و دینامیكیتی‌یەكی زیندووی تیایەو لـــە پاڵ هەموو ئەوانەشدا خەیاڵێكی فراوان . ئاواتێكی تیایە كە لـــەوە ئەچێ نەیەتەدی ، بەڵام كۆششی مەردانەی ئادەمیزاد ئەگاتە هـــەمووشت دێڕەكەش ئەمەیە .

**خـــوایە هەڵكـــەنی ئەو كێوە لـــە بن**
**بـــەڵكو دەركـــەوێ نووری دیدەی من[٣٠]**

ئەو سۆزو ڕاستگۆیی‌و وەفاداری‌یەی لە گۆرانی‌ی كوردی‌یا بەدی ئەكرێ ، هەر بەو چەشنە لەو شین‌و لاوانەوەیەدا بەدی‌ئەكرێ كە لـــە سەردەمی خەڵكن‌و بەرهەمی ئەوانن‌و بەشی فۆلكلۆری كوردین :

**كـــە من دیم خەسرەو خوێن بە بـــەرگەوە**
**ئیتر نیـــم وەتەنگ سزای مـــەرگەوە[٣١]**

بەڕاستی ئەم دێڕەش لە خۆیدا تابلۆیەكە كە ئەڵێی پەڕی دەستی نەخشەكێشێك خستوویەتی‌یە سەركاغەزو بەڕەنگی سوورو چـــەند

ڕەنگی‌تر ، وێنەی مەرگ‌و کۆچ‌و گۆڕی تاریک‌و سزای مـــــەرگ‌و وەفاداری‌ی زیندوانی خستۆتە بەرچاو • هەر لەم بارەیەوە با سەیرێکی ئەم دێڕەش بکەین •

**ئـــــەوەندەم داخ‌خـــــوارد داخ دلی بـــردم**
**چوومە شەرای مەرگ عـــەجەب نەمردم** [٣٢]

گەرشین‌و لاوانەوە تابلۆی غەم‌و ناخۆشی بخەنە بەرچاو ، ئـــەوا ( لای‌لایەی ) کوردی جاروبار تابلۆی غـــــەم‌و ئازاری باو و باپیر پیشان‌ئەدەن‌و لە دواییشدا ئاوات‌و ئازایی‌و وێنەی هیمەت‌دانەبەرە •

گەر غەم‌و ئازار وێنەی بەشی زۆری ئەم جۆرانەی گۆرانی بێت ، ئەوا هەر لەوێدا دیمەنی ئێش‌کردن‌و ڕەنج‌دان‌و زەحمـــەت کێشانیش دیارە ، هێزی بازو و ئارەقی ناوچەوان‌و نانی‌حەلال لـــــەناو دێڕی ئەم گۆرانی‌یانەدا بریسکەیان‌دێت ، بەڵام ئەمانە بێ‌وێنەی سەختی‌ی ژیان‌و ئێش‌وئازارو ئەو زام‌و برینانە نابن کە لە سەدان سالی کێشەدا لـــــە پێناوی ژیاندا ، لە کۆڕی ئارەق‌ڕشتنا ، لە مەیدانی کۆست‌کـــــەوتن‌و جگەرسووتانا ئەمێنێتەوە ، ئەمانە جێگەیان بە جۆرێك بۆ خـــۆیان کردۆتەوە کە لە قووڵایی دڵەوە دێنە سەر زمان‌و ئەبن بە گۆرانی :

**خـــــــەم تۆ برامی ، خـــــــەم تۆ برامی**
**خـــــەم کاروان‌سەرای شەو مـــــەنزلگامی** [٣٣]

یا ئەڵێ :

**خـــــەم‌بوو بە نانم ، خەم‌بوو بـــە بـــەرگم**
**خـــــەم کاروان‌سەرای شەو مـــــەنزلگامی** [٣٣]

لە لووتکەی بەلاغەتی ئەم جۆرە بیرەدا ، لە وێنەیەکی ســـــادە ، بەڵام قووڵدا ، ئەم دێڕەش ئەبینین :

**ئـــــەی کێوەی دیارە تـــــەمی لە بنــــــە**
**ئـــــەوە تـــــەم نی‌یـــــە هەناسەی منـــە** [٣٥]

گۆرانی‌ی ( لیریك )ی کوردی ، هەمووی پارچەو دیمەن‌و وێنەی ڕەنگین‌و نەخشەو تابلۆی تازەو ڕەنگاوڕەنگ‌و تەڕو پاراوە • هـــــەر

دێره بە جۆرێك هەستو عاتیفە دەرئەبڕێ ، جۆرە ئاواتێك ، جۆرێك لە دەرخستنی لەسەرپەیمانسووری‌و دڵسۆزی‌و ڕاستگۆیی • گەر لە جیهانی ئەمڕۆی ڕەخنەی ئەدەبا ، لێكدانەوەو شی‌كردنەوەی قەسیدەو پارچە هۆنراو باسێكی تایبەتی‌بێت ، ڕەنگە هەر دێرە لەمانە، یا ساكارو سادەش‌بێت ، لە خۆیدا تاقە یەكی هۆنراو بێت گەر قەسیدەیەكی تازە كۆمەڵە تابلۆیەك بێت ، ئەوا لە هەر دێڕێكی گۆرانی‌ی كوردی‌دا تابلۆیەكی تایبەتی ئەبینین‌و ئەمەش دەوڵەمەندی‌و قووڵی‌و بایەخی گەورەی ئەم بەشەی ئەدەبی فۆلكلۆرمان‌و گەنجینەی نەتەوەیی‌مان دەرئەخات •

(1) هەرچەندە كە لە مەیدانی فەلسەفەدا هیچ جۆرە بێتەرەفی‌و هاوسەنگی‌یەك ناگونجێ‌و بێ‌ئەوەی لەو ڕێچكەیەی فەلسەفەش لابدەین كە باوەڕمان پێی‌هەیە : نابێ لێكدانەوەی مێژوو وژیانی كۆمەڵایەتی‌و ئەدەبیاتی هیچ نەتەوەیەك بە ووشكی لێك‌بدەینەوە . یا نابێ تەجروبەی گەلانی‌تر لە مەیدانی لێكۆڵینەوەدا بە تەرازوویەكی بێ‌عەش بزانین بۆ تەجروبەو ژیانی خۆمان . ئەبێ بۆ لێكۆڵینەوەی مێژوو و ژیانی كۆمەڵایەتی‌و ئەدەبیاتی خۆمان ، تەجروبەو جۆری لێكدانەوەی خەڵكی بگرینە بەرچاو و لەو تەجروبەیەو لە بەرهەمەو زادەی‌بیرو تێ‌بینی ژیانی خۆمان جۆرە تەرازاوویەكی تازە بهێنینەكایەوە . كە نە تەواو لەوەی گەلانی‌تر بچێت‌و نە لەویش دووربێت .

(٢) « سەرەمایەکی ئەدەبیاتناسی » . ل ٢٦٤

(٣) گ . یوسپێنسکی . گۆرانی‌ی میللەت . گۆڤاری « رووسکی‌یە فیەمەستی - سیەی رووسی » ، ١٨٨٩ ، ژمارە ١١٠

(٤) سەرەمایەکی ئەدەبیاتناسی . ل ٢٦٥ .

(٥) بڕ ئەم بەشەی تەماشای « سەرەمایەکی ئەدەبیاتناسی » کراوە .

(٦) محەمەد حەسین پەهدی پوژبەیانی ، نامەیەکی تایبەتی بۆ نووسەر ، ١٨-٦-١٩٦٨ تاران

(٧) دیوانی مەولەوی ، کۆکردنەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس ، بەغدا ، ١٩٦١ ل ٥

(٨) بۆ ئەم مەبەستە بە دریژی لەگەل ئەم مامۆستایەی مەقامی کوردی‌دا دواوم .

(٩) دکتر محمد مکری : گورانیو ترانه های کردی . تهران ١٣٢٩ ص ١١٤ .

(١٠) موکری . ل ، ١٢٥

(١١) دەستنووس

(١٢) دەستنووس

(١٣) بۆ ئەوەی زیاتر لە دابەشکردنی گۆرانی‌ی بۆنەکانی کوردان بنەبت تەماشای کتێبی « سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە » و ژمارەکانی گۆڤاری شەفەق و بلێسەو پۆژی نوی بکە .

(١٤) دەستنووس .

(١٥) موکری ل ٩٩

(١٦) دەستنووس .

(١٧) موکری . ل ، ٩٩

(١٨) موکری . ل ، ١٣ .

(١٩) موکری . ل ، ٤٦

(٢٠) دەستنووس .

(٢١) دەستنووس

(٢٢) دەستنووس

(٢٣) موکری . ل ، ٢

(٢٤) موکری . ل ، ١

(٢٥) موکری . ل ، ٩

(٢٦) دەستنووس

(٢٧) دەستنووس

(٢٨) موکری . ل ، ٨٥

(٢٩) دەستنووس

(٣٠) دەستنووس

(٣١) دەستنووس

(٣٢) دەستنووس

(٣٣) موکری . ل ، ٤٩

(٣٤) دەستنووس

(٣٥) دەستنووس

## پەندی پێشینانو قسەی نەستەق :

گەر ئەو بەشانەی فۆلکلۆری کوردی کە تا ئێستا باسمان کردوون نەختێك خرابنە پشت گوێو کەمتەرخەمی لە کۆکردنەوەیانا بوویێت ، یا ماوەو توانای کۆکردنەوەیان نەبووبێ ، ئەوا پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی لەوان بەختەوەرتر بوونو بەشێکی زۆریان کۆکراونەتەوەو نووسراونەتەوەو چاپ کراون .

کۆنترین کومەڵەی کۆکراوە ، ئەوەیە کە لە ساڵی ١٩٣٣دا ئیسماعیل حەقی شاوەیس بە ناوی ( قسەی پێشینان )ەوە کۆی کردۆتەوە[1] ، لەوێدا ( ٦٠٣ ) پەندی پێشینانی نووسیوەتەوەو لەسەر بناغەی پەندی ( سیاسی ، ئەدەبی ، ئیجتماعی ، ئیقتیسادی ، کۆمیك ــ گاڵتە ) دابەش کراوە . شاوەیس سەرەتایەکی بچووکی بۆ ئەم کتێبەی نووسیوەو لە کۆتاییشدا بە دوو لاپەڕە ، لە تەنگوچەڵەمەی کوردی نووسین دواوە ، لەو پێشەکی یەداو لەو دوو لاپەڕەیەشدا گەلێك بیری وورد بەدی ئەکەین کە بۆ ئەو ڕۆژە تەواو تازەبوونو ڕۆڵێکی بیروناکی ی پێشڕەویان داوە بە خاوەنەکەی . هەر وەك ڕووکردنە پەندی پێشینانو قسەی خەڵك ، لەو ساڵانەدا بەڵگەی باوەڕێکی بە تینن بە نەتەوەی کوردو بە خەڵکی زەحمەتکێش . دوا بەدوای ئەو مەعرووف جیاووك لە ساڵی ١٩٣٨دا بە ناوی ( هەزار بێژو پەند )ەوە[2] ، هەزار پەندی پێشینانی کوردیی لەسەر پەیرەوی تیپی هیجا کۆکردۆتەوەو لە چاپی داون . لە گۆڤاری گەلاوێژیشدا گەلێك پەندی پێشینانو قسەی نەستەقی کوردی چاپ کراون . بەڵام لەمانە هەموو فراوانترو کوکترو هەمەڕەنگتر ، کۆمەڵەکەی شێخ محەمەدی خاڵە[3] ، هەرچەندە ئەمیش هەر بە پێی تیپی ئەبجەد ڕیزکراوەو دابەش کراوە ، بەڵام لە فراوانیدا پێش کۆمەڵەکانی تر ئەکەوێت .

به شێوەی کرمانجیی ژووروش گەلێك کتێبی پەندی‌پێشینان چاپ‌کراوە . لەوانە کۆمەڵەکەی جگەرخوێنی شاعیرە کە لە ساڵی ١٩٥٧دا لە شام چاپی‌کردوە[٤] ، هەروەها لە حەڵەبیش ئەفەری تەقاویت « جەمیل کەنە » کۆمەڵێك پەندی کوردیی بە وەرگێڕانی عەرەبی‌یەوە چاپ‌کردوە[٥] . هەروەك زاناو فۆلکلۆرناسە کوردەکانی وولاتی سۆڤێتیش گەلێك بە پەندی‌پێشینانەوە خەریك‌بوون . لەمانە : دوکتۆر حاجی‌جوندی‌و جاسمی جەلیل بە جیا پەندی‌پێشینانیان چاپ‌کردوە ، هەر وەك دوکتۆر قەناتی کوردۆو دوکتۆر مارگرێت ڕۆدینکۆ کۆمەڵەیەك پەندی‌پێشینانی کوردی‌یان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی رووسی .

## پەندی پێشینان چی‌یە ؟

پەندی‌پێشینان بریتی‌یە لە بەرهەمێکی زۆر کۆنی خەڵك . ئەم پەندە هەمیشە لەلای گەلانی سەرەتایی‌و سادە فەلسەفەی ڕاستەقینەو لەکاری ڕەوشت‌وخووە ، هەموو ڕاستی‌یەك ، هەموو ڕووداوێکی ژیانی ئادەمیزاد ، هەموو کردارێك ، چاك یا خراپ ، هەموو گەیشتنە ئەنجامێك کە میللەت گەیشتبێتێ ، دەربارەی هەرچی‌یەك بێت ئەچێتە تەرازووی پەندی‌پێشینانەوە .

پیاوانی دنیادیدە ، بە پەندی‌پێشینان ، لاوانو نەوەی تازە فێری ڕەوشت‌و خوو ئەکەن . خراپەو کەموکووڕی‌ی پێ‌چارئەکەن . لە کاتی ناخۆشی‌و ماتەمدا پەنا ئەبەنە بەر ئەم پەندانە ، پەندی واش هەیە لە وێنەی گاڵتەپێ‌کردن‌و گاڵتەکردن‌دان‌و خەڵکی بۆ خەم ڕەواندنەوە ئەیگێڕنەوە . پەندی‌پێشینان لە خۆیدا ئەنجامێکە کە ژیریی گەل لەسەر بناغەی دنیادیدەیی‌و تەجروبەیەکی دەوڵەمەند گەیشتوویەتێ .

پەندی پێشینان لە ناوەڕۆکدا لە قسەی نەستەقەوە نزیکە ، بەڵام هیچیان ناتوانن جێگەی ئەویتریان بگرنەوە .

قسەی نەستەق کەمتر مەبەس ئەدات بەدەستەوە ، واتە مانای زۆر ڕۆشن نی‌یەو لەقسەکە خۆیدا دەرناکەوێ ، جاری وا هەیە زۆرکەس بە تەواوی لە مانای ناگەن •

پەندی پێشینان ، یا قسەی نەستەق ، ڕستە ووتەیەکی کورتە ، مانایەکی فراوان‌و قووڵی تیایە • پەندی پێشینان زۆرجار ڕاستەوڕاست ئەنجامێك ئەدات بەدەستەوە وەك ئەڵێ : بەندە بێ عەیب نابێ ، یاخود ، یا ئاو بتبا لە پردی نامەرد مەدە • یا ئەم پەندانە یەکسەر مانا نادەن بە دەستەوەو ئەبێ لە قسەکە ووردبیتەوەو بگەیتە مەبەس ، وەك ئەڵێ ، سەرێکی هەیەو هەزار سەودا • ئاش‌هارِ لە خەیاڵێك ، ئاشەوان لە خەیاڵێك • بە گوڵێك بەهار نایەت • کەڵەشێریش نەبێت خوا ڕۆژ ئەکاتەوە • پەندی‌پێشینان‌و قسەی نەستەق ، بە زۆرتر قسەی گەلەو خاوەنەکەی دیار نی‌یە • بەڵام زۆرجار هەیە نیوە هۆنراوێك ، یا بەیتێکی تەواوی شاعیرێك ئەکەوێتە سەرزمان‌و ئەبێ بە پەند • بۆ نموونە ئەو نیوە دێڕەی نالی‌یە کە ئەڵێ : بێ بەرگی‌یە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە[٦] • یا ئەو نیوە دێڕەی حەمدی کە ئەڵێ : مێشێ گەیشتە ڕووی نیگارێك لە خاڵ ئەچێ[٧] •

بەڵام ئەتوانین ئەم نیوە هۆنراوانە کە خاوەنیان دیارن ناوبنێین قسەی نەستەق‌و بەوە لە پەندی‌پێشینانیان جیا بکەینەوە • بەڵام لەپاڵ ئەم هۆنراوانەشدا زۆرجار ئەبێ کە پەندی پێشینان خۆی هۆنراوەو خاوەنی هۆنراوەکە دیار نی‌یە وەك :

لەشەل هەڵکەوتم خۆمدا بە کوێردا
خوا بەختی منی هەر لارو وێردا[٨]

یا ئەم دوو بەیتەی شێخی خاڵ لە سەرەتای پەندی پیشینانەکەیدا کردوویەتی بە نموونە :

ئاوی بڕوا بۆ ڕۆخانە    خوێش بیخوا نەك بێگانە[٩]

یا ئەڵێ :

بە زستانان پینەوپەڕۆ بە هاوینان ورد ورد بڕۆ[10]

زۆرجاریش هەیە پەندی پێشینان هۆنراو نی‌یە بەڵام دوو بەشەو کۆتاییشیان بە « سەجع »ێکی یەك قافیە دێتەوە ، وەك ئەڵێ .

( تەمەڵ ئەڵێ هەمووی ئەخۆم ، دوایی ئەڵێ چیم‌کرد بە خۆم )[11]

یاخود ئەڵێ : ( ئەگەر زانیت ئەزم ، ئەگەر نەتزانی دزم )[12] .

یا ئەڵێ : ( ئەگەر گۆشت گرانە ، نەخواردنی هەرزانە )[13] .

یا : ( حەوتی بمرێ لە باوان ، سورمەی نابڕێ لە چاوان )[14] .

پەندی‌پێشینان هەروەك خۆی لە ڕێزی فۆلکلۆردا شتێکی تایبەتی‌یە . هەروەها لەگەڵ خۆیدا بەشێکی تری فۆلکلۆر ئەهێنێتەکایەوە کە ئەویش کورتە چیرۆکە . چونکە هەموو پەندێك سەرەتایەکی هەیە ، واتە ، شتێك ، قەوماوێك ، کارەساتێك ، ڕووداوێك ڕووی داوە ، لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو پیاوە ژیرە ئەو قسەیەی کردوە کە بووە بە پەندو مەسەل‌و بڵاوبۆتەوەو ماوەتەوە . نرخێکی گەورەی کۆمەڵەی ( پەندی‌پێشینان )ەکەی خاڵ لەوەدایە کە زۆر بەدوای ئەم چیرۆکانەدا گەڕاوەو زۆری پەندەکانی بردۆتەوە سەر سەرچاوەکەی . هەرچەندە دۆزینەوەی سەرچاوەو چیرۆکی هەموو پەندێکی کوردی ئەرکێکی گرانە[15] .

پەندی‌پێشینان ــ وەك ووتمان ــ ڕەوشت‌و خوو سروشت‌و ژیری‌و دیمەنی ژیانی گەل ئەخاتە بەرچاو ، هەر لەبەر ئەمەشە کەوا لەلای زۆر لە میللەتان پەندی هاوبەش هەیە . جاری وا هەیە پەندێك لەدەیان زمانی گەلانی ئەم سەرزەمینەدا ئەبینرێ وەك : ( دەستی ماندوو لەسەر سکی‌تێرە )[16] . ئەم پەندە کە وێنەی ئیش‌کردن‌و ڕێزنانە لە ئیش ، لە پەندی پێشینانی زۆر لە گەلانی زەمیندا ئەبینرێ ، ئیتر یا یەکسەر هەر لەو قالبەدا ، یا ووشەکان ئەگۆڕدرێن‌و ماناکە هەر خۆیەتی .

گەر بە وردی لێی بکۆلینەوە ئەبینین بەشێکی زۆر لـە پەندەکانی گەلانی ڕۆژهەڵات هاوبەشن و لەیەك ئەچن ، ئەمەش هـەر بەوە لێك ئەدرێتەوە کەوا ژیانی ئەم گەلانە لە زۆر دیمەنیدا لەیەك ئەچێت و لە ڕووی گـۆڕران و بەرەوپێش چـوونی ژیـانی ئابووری و کۆمەڵایەتی یەوە ئەم گەلانە بە پلەو ڕژیمی لەیەكچودا تێپـەڕبوون و پیاوی ژیریان تەجروبەی لەیەكچوویان دەربارەی ژیان وەرگرتوە ، بەهەموو تاڵی و شیرینی یەکی ژیانەوە • لەم بارەیەوە نمـوونە زۆرەو ئەم باسە لە خۆیدا کەرەسەی لێکۆلینەوەی قووڵ و گەورەیە • بەڵام ئەتوانین لە ڕیزی ئەم نموونانەدا ئەو پەندە کوردی یە ببینین کـە ئـەڵێ :

« هەموو ڕێگایەك ئەچێتەوە سەربانە »(١٧) • ئەمە تەواو لـە پەندێك ئەچێت کـە لە زۆر زمانی ئەوروپادا هـەیەو شاعیرێکی عەرەبیش کردوویە بە نیوە هۆنراوەیێك کە ئەڵێ : « کـل الطرق الیك یا روما تعود » واتە • ئەی شاری رۆما ، هەموو ڕێگایەك دێتـەوە سەرتۆ(١٨) • یا ئەو پەندە کوردی یەی ئەڵێ : چەمی درۆ سـەرچاوەی نزیکە ، ئایا ئەم پەندە هەر لەوە ناچێت کە بە عەرەبی و گەلێك زمانی تر هەیەو ئەڵێ « حبل الکذب قصیر » واتە ــ پەت یا گوریسی درۆکردن کورتە ؟ هەندێك لەم لەیەكچوونانە هەر لەبەر ئەو ( هۆ ) عیلمی یەیـە کە باسمان کردو هەندێکیان هەر وەرگێڕانن لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر لەلایەن خوێندەواری ئەو نەتەوەیەوە • ئەم باسەش سـەرچاوەیە بۆ لێکۆلینەوەی درێژو ئەتوانرێ کتێبی گەورەی دەربارەی ( بەراوردی پەندی پێشینانی کوردی لەگەڵ پەندی نەتەوەکانی تردا ) لەسـەر بنووسرێ •

بەڵام لێرەدا پێویستە باسی پەندی پێشینان لـە زمانی کوردی خۆیدا بکەین • چونکە شتێکی زۆر ئاسایی یە کـە لە دیالێکتـە جیاوازەکانی کوردیدا بەشی زۆری پـەندی پێشینان لەیەك بچێت و

تەنانەت هەر وەرگێرانی یەکتر بێت لـــــە دیالێکتێکەوەبۆئەویتر • هەندێ جار لە یەکێ لە بێچووەکانی[١٩] دیالێکتێکـــەوە بۆ ئەوی‌تر هەندێ پەندئەگۆڕرێ ، وەك بڵێین لە ڕووی زمانەوە زۆرجار پــەندێك کە ناوەڕۆكو دارشتنی یەکەو لە ناوچــەیەکەوە بۆ ئەوی‌تر کـــە دیالێکتیان یەکەو لە بێچوویەکی جیان ، ئـەگۆڕرێ • وەك موکریانو سلیمانیو هەولێر ( سۆران ) ، کەهـــەرسێ‌لا بە کرمانجی‌ی خواروو ئەدوێن بەلام هەر یەکە لە بێچوویەکن پەندی‌پێشینان ئەگۆڕێ • ئـەم گۆڕرانەی پەندەکان ، هەر ئەو گۆڕرانەیە کە لە زماندا‌و لە قـەدا لە ناو دیالێکتەکانو بێچووەکانیانا ڕووئەدات • وەك ئەوەی فـــەرمانی داهاتوو لە سلیمانی بە ( ئە ) دەست‌پێ‌ئەکات ، کەچی لە هـــــەموو دیالێکتەکانی‌ترداو لە بێچوەکانی تری کرمانجی‌خوارووشدا لـــــە ( سۆرانی ، موکری ، سنەیی )دا هەر ( دە )یە • وەك ئـەڵێن ئەڕۆم ، دەڕۆم ، ئەخۆم ــ دەخۆم •• هتد • یا وەك لەیەك پــــــەندا ئەبینین پەندەکە هەروەك خۆیەتی کەچی ووشەی کەلەشێر بووە بــە کەلەباب ، یا مریشك بووە بە مامر • زۆرجاریش هەیە بە جارێك نیوەڕستێکی یا ڕستێکی پەندەکە بە جۆرێکی‌تر ئەگێرێتەوە ، بۆ نمـوونە ــ پەندێك هەیە ئەڵێ : ( هەتا ڕێوی قـــــەواڵەی خۆی خـــوێندەوە پێستیان کرد )[٢٠] • هەر ئەمە ئـــەبێ‌بە : ( هەتا ڕیوی قەواڵـــــەی خۆی خوێندەوە کـــەوڵی برا بۆ دەباغ )[٢١] • یا لە جیاتی ئـــەوەی بڵێین پێستیان‌کرد ، ئەڵێن کەولیان‌کرد[٢٢] •

پەندێکی‌تر هەیە ئەڵێ : (مارانگاز لە خشەی مێروو ئەترسێ)[٢٣] • ( دیارە مێروو لێرەدا مێرووڵەیە ) کەچی هەر ئەم پەندە بە جۆرێکی تر ئەگێررێتەوە کە ئەڵێ : مارانگاز لە خشەی گوریس ئەلـەرزی[٢٤] • پەندێکی‌تر ئەڵێ : ( چاکە بکەو بیدە بە دەم ئاوەوە )[٢٥] • هـــەر ئەم پەندە بەم جۆرەش ئەووترێ : « چاکە بکـــــەو بە ئاوی‌دادە »[٢٦] • یا ئەڵێ : ( زمان بوەستێ سەر زۆر رەحەتە )[٢٧] ، هەر ئەم پەندە ئەبێ

بە : ( زمان پێـەڵێ سەر ڕەحـەتـە )[28] • دیارە کە ئەم جـۆرە گۆڕینانە لە ئەنجامی گێڕانەوەدا • لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك ، لـە پشتێکەوە بۆ پشتێك ، یا لە کەسێکەوە بۆ ئەویتردا پـەیدا ئەبن • بەڵام ئەوەی لە جوانیی پەندی پێشینانی کوردیدا سەرنجڕائەکێشێت ئەوەیە کە زۆرجار لە یەك مانادا دوو پـەند یا زیاتر داڕێژراون کـە مەبەس هەر یەکە بەڵام دیمەنو وێنەیان جیایە[29] • بۆ نموونە پەندێك هەیە ئەڵێ : ( ئاسنی سارد بە فوو نـەرم نابێ ) • هەر لـەم ماناو کەرەسەیە پـەندێکیتر داڕێژراوە کـە ئەڵێ : ( ئاسنی سـارد ئەکوتیت )[30] • یا پەندێك هەیە ئەڵێ : بوو بە کوردەکەی لەهەردوو جەژن بوو • هەر لەم مانایەدا لە کەرەسەیەکی جیا پەندێکیتر داڕێژراوە کە ئەڵێ : ( بۆ ڕیش چوو سمێلی نایەبان )[31] • جاریوا هـەیە مانا یەکەو کەرەسە جیایەو شێوەش جیایە • پەندێك هەیە ئەڵێ : ( چـەم بێچەقەڵ نابێ )[32] • هەر لەم مانا قووڵەی ئەم پەندەدا ، لە شێوەیەکی ئەدەبیی ڕەنگینا پەندێك داڕێژراوە ئـەڵێ : ( گوڵ بێقنچـك نابێ )[33] • یا ئەڵێ : ( باغ بێ دڕك نابێ )[34] •

کورد ئەڵێن : ( تاریکی مانگەشەو سەر لەئێـوارە دیارە )[35] • هەر لەم مانایەدا پەندێکیتر ئەڵێ : ( سەرمای زستان لـە هەوەڵەوە دیارە )[36] • پەندێکیتر هەیە ئەڵێ : ( ڕێوی دەمی بە ترێ نـەگات ، ئەڵێ ترشە )[37] • هەر ئەمە بە جۆرێکیتر ئەگێڕێتـەوە ئەڵێ : ( ڕێوی دەمی نە ئەگەیشتە ترێ ئەیووت ترشە )[38] •

لە پەندیپێشینانا جاری وا هەیە هەر تاقە کەرەسەو وێنـەیە بۆ دوو مانا بەکار ئەهێنرێو ماناکان زۆر لە یەك جیاوازان • ئـەم مانا جیاوازی‌یە لەیەك‌نەچوونێکی زۆر قووڵی ژیان خۆیو سروشتی شتێك لە ژیاندا ئەخەنەڕوو و کە ئەتوانین بڵێین شیکردنەوەی ئەو بنـەڕەتەی بیری فەلسەفەن کە ئەڵێ ، زۆر جار شتێکی پێکەوە لکاو یا پێکـەوە ژیاو لە ناو جەرگەی خۆیدا سروشتێکی لەیەك‌نەچووی هەیە • ئەمـە

له پەندی پێشینانی کوردیدا لە وێنەی ( مۆم )دا دەرئەکەوێ . لــە زۆر شوێنداو لە ئەدەبیاتی کلاسیکیی زۆر نەتەوەی ڕۆژهــەڵاتداو لەلای کوردیش ( مۆم ) وێنەی فیداکاریو سووتاندن بووە ، بــۆ ئەوەی ڕێگە بۆ خەلکیتر ڕۆشن بکاتەوە . کەچی ئەبینین لە پەندێکی کوردیدا هەر ئەو مۆم یا ( شەم )ی وێنەی فیداکارییە بۆتە نیشــانەو وێنە بۆ کەسێك کە سوودی بۆ کەسوکار ( لە ئاسۆی تەســـکدا )و بۆ ووڵاتو نەتەوەی خۆی لە ئاسۆی فراواندا نەبێت . ئــەو پەندە ئەڵێ : ( وەك مۆم شەوقی بۆ بنی خۆی نییە )[39] . هەر لەم مانایەوە نزیك ، پەندێکی تر هەیە کە ئەڵێ : ( وەك چرا شەوقی بۆ ژێر خــۆی نییە )[40] .

زۆرجار لە پەندی پێشینانا ئەبینین لە گێڕانەوەیـــەکی پەندێکا ووشەیەکی کوردی بەکارئەهێنرێ ، لە گێڕانەوەیەکیتردا ووشەیەکی عەرەبی یا زمانێکیتر کە ( هاوتا )و هاومانای ووشە کوردییەکـــەیە بەکاردێت . ئەمەش دیسان بە پێی شوێنوکاتو گێڕانەوەو ئـــەو کەسە کە ئەیگێڕێتەوە ئەگۆڕرێ . بۆ نموونە پەندێك هــەیە ئەڵێ : ( حەیا قەترەیەکە تکا ، تکا )[41] . جا لە هەندێ گێڕانەوەدا ئەبێ بــە ( قەترەیەك بە ناوچەوانەوە کە تکا ، تکا )[42] . بەڵام لێرەدا مــەبەس لە ووشەی ( حەیا )یە کە لە هەندێ گێڕانەوەدا ئەبێ بە ( ناموس ) کە لە ووشەی ( حەیا ) نزیکترە لە کوردییەوە ، وە ووشەی ( قەترە )ی عەرەبی کە لە گێڕانەوەیتردا ئـــەبێ بە ( تنۆك ) یا ( دلوپ )ی[43] کوردی[44] . لە ڕووی تێکەڵبوونی ووشەی عـــەرەبییەوە ئـــەم پەندانەش نموونەن : ( بۆ پیاوی عاقڵ ئیشارەتێ بەسە )[45] ، ( قەزاو بەڵا لە ماڵی دونیا بکەوێ )[46] ، ( عوزر لە قەباحەت خراپترە )[47] . یا ئەڵێ : ( عەقڵ بەبێجان لە عەزابە )[48] . لەگـــەڵ ئەمەشــــدا پەندی پێشینانی کوردی وەك پەندی گەلانی تر نرخوبایەخی گەورەی لە زمانەکەیدایە ، واتە نموونەیەکی جوانی کوردیی پەتیو ســادەیە .

بۆ نموونە کورد ئەڵێن :

( دڵ ئاوێنەی دڵە )[٤٩] ، ( مەنجەڵی مەردان بە چل ساڵ دێتە جۆش )[٥٠] . ( ئەو شوێنە خۆشە کە دڵ لێی خۆشە )[٥١] ، ( ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار )[٥٢] . لەم پەندانەدا وێنەیەکی جوانی زمانی کوردی ئەبینین ، تەڕیو پاراوی زمان ، سادەیی‌و جوانیی کوردیی پەتی . ئەو ووشانەی پەندەکەی پێدارێژراوە لە خۆیدا کەرەسەیەکی باشە بۆ ساغ‌کردنەوەی کۆنیو تازەیی پەندەکە خۆی . ئەوەی کە پەندەکان خۆیان بە کوردییەکی پەتیی سادە نووسراون ، بەڵگەی کۆنیی ئەم پەندانەن . واتە پەندی کاتێکن کە کوردی ئەوەندە تێکەڵ بە زمانی بێگانە نەبووە . یا پەندی چەند جێگەو تیرەیەکن کە خەڵکەکەی کەمتر تێکەڵی گەلانیتر بووزو زمانە کوردییەکەی خۆیان بە سادەییو پەتییەتی پاراستوە . هەندێ لەو پەندانەی ووشەی زمانیتری وەك فارسیو تورکیو عەرەبییان تێکەڵ بووە ، پەندی ئەو دەمەو ئەو شوێنانەن کە کورد لەگەڵ ئەم گەلانەدا دەستی بە تێکەڵ بوونو هاتو چۆ کردوە . ئەم ڕووداوە هەروەك ئەبێ زمانەوان ساغیبکاتەوە،هەروەها مێژوونووسیش ئەتوانێ هەوڵی ساغ‌کردنەوەی بدات . بۆ نموونە لە پەندێکا ئەڵێت : ( شیری میسر لە کالانا ناوەستێ )[٥٣] . جا ئەبێ مێژوونووس ئەوە ساغ‌بکاتەوە کە کەی کورد ناو یا دیمەنی شیری میسری بیستبێ یا دیبی . یا ئەڵێ : (شاران لە حەسرەت بەغدا ئەکران ، بەغداش وێران بوو )[٥٤] . ئایا ئەم پەندە ئەبێ باسی کام وێرانبوونی بەغدا بکات ؟ ئەوی زەمانی هۆلاکۆ یا وێرانبوونێکیتر ؟.. هەروەك هەندێ پەند هەیە ڕێکاوڕێك باسی هەندێ ناو و شار ئەکەن کە سەرچاوەزانینی خەریك بوونێکی ئەوتۆی ناوێ . وەك ئەڵێ : ( نەوشیروان حاکم‌بێو بەختەك وەزیر بێ ، هەزار کەلاوە بە پوولێك )[٥٥] . یا ئەڵێ : خەبەر بدەن بە یەزەنەجرت[٥٦] ، کارەکەر کارەکەری گرت[٥٧] . یا ئەڵێ : خوا لە

سولتان مەحموود گەورەترە[٥٨] . هەر لە ڕووی زمانەوە ، زۆر جار وردەکاری‌یەکی جوان لە پەندی‌پێشینانی کوریدا ئەبینین ، بۆ نموونە ووشەی دوورو پوورو سوور لە چەند پەندێکدا . پێشینان ووتویانە: ئەوی لە تۆ دوورە ، ڕەنگی سوورە[٥٩] . هەر ئەم دوورو سوورە لە شوێنێکی‌تردا بووە بە پەندێك کە ئەڵێ : ئاگرە سووریێ لـــە خۆم دووریێ[٦٠] ، یا ، خەتاسووریێ لە خۆمان دووریێ[٦١] . یا ئەم سەجعە خراوەتە مانایەکی ترەوەو بووە بە پەندێك کە ئەڵێ : چوومـــە دوور بووم بە پوور[٦٢] . لە شوێنی‌تردا لە پاڵ جوانی‌ی سەجعدا یەك بـــە دوای یەکا هاتنی ووشە ئەبینین کە لە شێوەی تاقگەدا دێنـــەخواریێ ، وەك : زۆربێ‌و بۆربێ ، بۆربێ‌و تیربێ . تێـــــربێ‌و تیربێ بۆ دۆم ئەبێت[٦٣] .

ووتمان زمان لە پەندی‌پێشیناندا ڕەگەزێکی بنەرەتی‌یەو جوانی‌و پوختەیی‌و ساکاریی زمانیش ڕوخساری دیاری ئەم زمانەیە . زۆرجار لە پاڵ جوانی ناوەڕۆکدا پەندێك وەك پەیکـــەرێکی جوان دێتـــە بەرچاو ، بۆ نموونە ــ کورد ئەڵێن : بە گوڵێك بەهار نایـەت[٦٤] . یا ئەڵێن : بە سایەی گوڵە گەنمێکـــەوە هەزار گوڵـــە مرۆر ئاو ئەخواتەوە[٦٥] . یا ( گوڵە جویەك ئاو ئەخواتەوە ) [٦٦] . یا پێشینان ئەڵێن : شەممە بە کەم کەس[٦٧] . یا ئەڵێن : دیزە ڕەشەی دووکەڵ لە بن ، دەستە چەورەکەی خۆت ئەسووی لە من[٦٨] . یا لە مـــەیدانی جوانیدا پەندی وا ئەبینین کە نرخی گەوهەرو گەوهـــــەری زمان پیشان‌ئەدات وەك : گەوهەر لە ناو قوڕدا وون‌نابێت[٦٩] . جـوانترین پەندی کوردیش ئەوانەن کـــە سەربارەی « دڵ » ووتراون ، وەك : ( دڵ ئاوێنەی دڵە )[٧٠] . ( دڵ پارچە گۆشتێکە )[٧١] ، واتـــە « زۆر ناسکە » ، یا ( ئەو شوێنە خۆشە کە دڵ لێی خۆشە )[٧٢] . ئـــــەم پەندە لە پاڵ جوانی‌ی ووشەو زمانا پەیکەرێکی ئەوتۆیە کە ئەبزوێ ، واتە ساردو سڕ نی‌یەو دڵ ئەکات بە سەرچاوەی ژیان‌و هەستی بەرزی

ئادەمیزاد ئەکات بە سەرپشکی خۆشیو ناخۆشی لەیەك جیاکردنەوە •
لە مەیدانی زمانو جوانیی دارشتنا گەلێك پەندمان هەیە کە لوتکەی
تێکەڵبوونی جوانی دیمەنو ناوەرۆکن وەك ئەڵێ : ژاله بۆ وا تاڵی ؟
ئەڵێ لەبەر برا مردن ، گوڵت بۆ وا جوانە ؟ ئەڵێ لەبەر دۆستو
دوژمن[٧٣] • یا پێشینان ئەڵێن : رازت لای یەکێك دانێو پرست لای
هەزار[٧٤] • یا ، لە گوڵیان پرسی زۆر گەشی ، ووتی باخەوانەکەم
مەردە[٧٥] • هەندێ جار پەندێك وێنەو دیمەنو تابلۆیەك پیشانئەداتو
نەخشەیان ئەکێشیو وێنەکە ئەخاتە بزوتنەوە • وەك ئەو پەندەی
ئەڵێ : ( بەرماڵی بەسەر ئاوەوە ئەگەرێ )[٧٥] • جا گەر لە مانا
بگەرێینو هەر سەیری « تابلۆ »ی خەیاڵیی بەرماڵو روبارو سەر
ئاوبکەین ، دیمەنێکی تەواومان دێتەبەرچاو • پەندێکی تر ئەڵێ :
( سیروان لێشت نەدەم هەر ئەمبەیت ؟ )[٧٦] • ئەمیش گەر ناوەرۆكو
چیرۆکەکەی لەولاوە دابنێین هەر دیمەنی سیروانو هەڵچونو لافاو و
رێبواری لە دوورەوەهاتوومان دێنێتە بەرچاو کە خۆی لە ئاو لابدات ،
بەڵام ئاوی وەك ئاگر بێئامان هەر دوای بکەوێتو بیبات ، ئەویش
بەوپەری بەسزمانییەوە کزو بەڵکو بە سۆزیشەوە بڵێت : سیروان
لێشت نەدەم هەر ئەمبەیت •

(١) قسەی پێشینان اسماعیل حقی شاوەیسی ، بغدا ، ١٩٣٣
(٢) هەزار بێژو پەند ، دامزراوو کۆکردەوەی معروف جیاووك ، بغدا ١٩٣٨
(٣) پەندی پیشینان . شیخ محمدی خال ، بغدا ، ١٩٥٧
(٤) جگەرخوین . گوتنا پیشینا ، شام ١٩٥٧
(٥) جەمیل کنە . امثال کردیة . حلب ١٩٥٧
(٦) دیوانی نالی . هەولێر ، ١٩٦٢ ، ل ٧١
(٧) دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقران ، بغدا ، ١٩٥٧ . ل ٧٢

(٨) دەستنووس

(٩) خاڵ ، ل ١٢٠

(١٠) خاڵ ، ل ٣٦

(١١) خاڵ ، ل ٥١

(١٢) خاڵ ، ل ١٦

(١٣) دەستنووس

(١٤) خاڵ ، ل ١٧

(١٥) لەم بارەیەوە نووسەر جەمال بابانو محەمەد مەعسووم مانی هەوڵێکی بانسیان داوە . هەرچەندە بەرهەمەکەیان لەم بارەیەوە تەنیا بە رادیۆ بلاوکراوەتەوەو هێشتا چاپ نەکراوە .

(١٦) خاڵ ، ل ١٧٢

(١٧) دەستنووس

(١٨) گەر رۆما لای گەلانی ئەورووپا جێگەی پاپا بێتو خەڵکی لە ئەنجامدا رووبکەنەوە ئەوێ ، ئەبێ بۆچ لای ئێمە ( بانە )هەڵبژێررا بێت . تۆ بڵێی لەبەر ئەوە بێت کە سەرە رێگەیەکی کۆنەو مەڵبەندی کاروانی بازرگانی دەوریکی ژیانی کوردەواری بووە ؟ یا هۆیەکیتر هەیە ؟ ئەمەش لە خۆیدا گەرەیە بۆ لێکۆڵینەوەیەکیتر .

(١٩) وەك ئەزانین لە هەموو زمانێکدا چەند دیالێکتێك هەیەو هەر دیالێکتە ئەبێ بە چەند بەشێکەوە ، ئەو بەشانە شتێکن لە دیالێکت بچووکتر ، کە لە ناوچەیەکی تەسکتردا قسەی پێئەکرێ ، لە هەر زمانەدا شتێك بەم بەشە ئەووترێ . توفیق وەهبی ، بە کوردی ناوی ناوە « بنچووەشێوە ■ » بۆ نموونە شێوەی کرمانجی خواروو کە بە هەڵە سورانی پێئەووترێ ، ئەبێ بە چوار بنچووەشێوەوە دیالێکتەوە کە : ( سلیمانیو سۆرانیو سنەییو موکری )ن .

■ بڕوانە : توفیق وەهبی : ژمارەکانی ساڵی یەکەمی گۆڤاری گەلاوێژ ، بەغدا ١٩٣٩ » .

(٢٠) شازەیی ، ل ٤٠

(٢١) دەستنووس

(٢٢) دەستنووس

(٢٣) دەستنووس

(٢٤) خاڵ ، ل ١٤٢

(٢٥) خاڵ ، ل ٥٥

(٢٦،٢٧) خاڵ ، ل ٨٨

(٢٨) دەستنووس ١

(٢٩،٣٠) خاڵ ، ل ١٠

(٣١) خاڵ ، ل ٢٩

(٣٢) خاڵ ، ل ٥٧

(٣٣) خاڵ ، ل ١٢٤

(٣٤) دەستنووس ١

(٣٥) دەستنووس

(٣٦) خاڵ ، ل ٥٩

(٣٧) دەستنووس ١

(٣٨) خاڵ . ل ٨٥
(٣٩) دەستنووس
(٤٠) خاڵ . ل ١٦٤
(٤١) دەستنووس ١
(٤٢) دەستنووس
(٤٣) خاڵ . ل ٦٠
(٤٤) ئەم باسە سەرچاوەو کەرەسەیە بۆ وردبوونەوە لە کاتوشوێنی تێکەڵبوونی زمانەکەمان لەگەڵ زمانیتردا و چۆن ووشەی زمانیتر ، وە بە کام ڕێبازدا هاتۆتە ناو کوردییەوە .
(٤٥) خاڵ . ل ٢٩
(٤٦) دەستنووس
(٤٧) خاڵ . ل ١٠٥
(٤٨) ووشەی ( جان ) لێرەدا تێکەڵبوونی ووشەی فارسیش لەگەڵ کوردیدا دەرئەخات .
(٤٩) خاڵ . ل ٧٢
(٥٠) خاڵ . ل ١٥٣
(٥١) دەستنووس ١
(٥٢) خاڵ . ل ٩٠
(٥٣) خاڵ . ل ١٠٤
(٥٤) خاڵ . ل ٩٩
(٥٥) خاڵ . ل ١٦١
(٥٦) بەزدەجورد مەبەسە .
(٥٧) دەستنووس ١
(٥٨) سولتان مەحموودی غەزنەوی .
(٥٩) خاڵ . ل ٦٣
(٦٠) خاڵ . ل ٢٣
(٦١) خاڵ . ل ١٢
(٦٢) دەستنووس ١
(٦٣) دەستنووس ١
(٦٤) خاڵ . ل ٣٧
(٦٥) خاڵ . ل ٣٦
(٦٦)،(٦٧) دەستنووس ١
(٦٨) خاڵ . ل ٢٩
(٦٩) خاڵ . ل ١٢٩
(٧٠) خاڵ . ل ٧٢
(٧١) خاڵ . ل ٧٣
(٧٢) دەستنووس ١
(٧٣) خاڵ . ل ١٧
(٧٤)،(٧٥) خاڵ . ل ١٣٧
(٧٦) خاڵ . ل ٩٨

## ناوەڕۆکی پەندی پێشینانی کوردی :

ئـــەریستۆڤای ژنەنووسەری ســـۆڤیتی ئـــەڵێ : « ژیری و هوشیاری‌یەکی گەورە لە حیکایەتی ناوخـــەڵك و پەندی پێشینان و قسەی نەستەقدا دەرئەکەوێ . لەوێدا وێنەی مێژوو ، قـــەوماو ، ڕەوشت و عادەتی گەلی کورد ڕوون و دیارە . لەمانەدا پێوەندیی کورد لەگەڵ منداڵدا ، بە تایبەتی لەگەڵ کوڕی خۆیدا ، پێوەندیی لەگـــەڵ پیاو و ژنی پیردا ، لەگەڵ خێزانی خۆیدا ، لەگـــەڵ خانەخـــۆێ و کەیبانودا ، لەگەڵ ئافرەتدا ، لەگەڵ دۆســـــت و ناسیاودا ، لەگەڵ دڕ'وسبێدا بە باشی دەرئەکەوێ . کورد ئەڵێن[1] : حورمـــەتی پیران بگرە ، کـــــە پیربوویت ئەنجامی ئەبینی . هـــەروەها ئەڵێن : ژن کۆڵەکەی ماڵە . یا ، تەماشای ژن مـــــەکە بڕوانە دایك و باوکی ، هەروەها ئەڵێن : ژنی شەرمن دێنێ شارێك ، پیاوی شەرمن بزێـــك نایەنێ . یا ئەڵێن : ئەوی لە دۆستی بێ خەوش بگەڕێ ، بێ دۆســـت ئەمێنێتەوە .

لە باسی ئەفسانەی کوردیدا ووتمان : ئەفسانە بەرهـــــەمی دەوری منداڵێتـ ی ئادەمیزادە ، وە بەرهەمی کاتێکە کـــــە هێشتا ئادەمیزاد کشتوکاڵی نەکردبوە پیشە بەڵکو هەندێ ئەفسانە بەرهـــەمی پێش ئاگردۆزینەوەشە .

گەر ئەفسانە لە ڕووی ئاینەوە زۆر بیروباوەڕی تیابێت کـــە بە تەواوی، لە ئاینی کۆنی پێش ئیسلامەوە وەرگیرابێت ، ئـــەوا پەندی پێشینان بە تەواوی شەقڵی دەوری موسوڵمانبوونی لەلایەکەوە تیایەو لەلایەکی ترەوە بە ڕۆشنی دیارە کـــە بەرهەمی کاتی دەســـتدانە کشتوکاڵ و پاش ئەو پلەیەی ژیانی کۆمەڵایەتی‌یە . کورد ئـــەڵێن : خاڵۆی دەسەوسان ، چخوای گەرمیان و چخوای کوێســـان[2] . یا : ( ئەو کەسەی گیانئەدا گیانیش ئەسێنی)[3] .

ئەم پەندانە بە تەواوی ئاوێنەی بڕوای ئیسلامەتی‌یە بە خوایەکی تاق‌و تەنیا ، کە ژیان‌و مردن‌و زیندوبوونەوە بە دەست ئەوە ، وە ئەمە تەواو پێچەوانەی ئەو باوەڕەیە کە لە ئەفسانەدا دیمان ، باوەڕی خوای شەڕو خوای خێر ، کە لە ئاینی کۆنی پێش ئیسلامەوە وەرگیراوە ٠

لەم جۆرە پەندانە زۆرن وەك : ( تا نەینایە تەبەق نەبووت ، ئەللاهوسەدەق )[٤] ، لێرەدا مەبەسمان ووشەی ئەللاهو سەدەقە ٠ یا کورد ئەڵێ : بانگی محەمەد بە ئاشکرا خۆشە[٥] ٠ وە هەرچەندە ئەم پەندە بۆ ئازایی بەکارئەهێنرێ ٠ بەڵام زۆر دیارە کە لە چیرۆکە بەناوبانگەکەی عومەری کوڕی خەتابەوە وەرگیراوە[٦] ٠

یا کورد ئەڵێ : « سۆفیلکەی بەرماڵ بەشان ، بە ڕۆژ ئەگەڕێ کۆلان بە کۆلان ، بە شەو دێتەوەو ئەڵێ ـ ئەللاهو ئیمان »[٧] ٠ دیارە مەبەسیش لێرەدا هەر ووشەکەی دووایی‌یە ٠

پەندێکی‌تر هەیە ئەڵێ : « کە ووتی تێژ تێژ »[٨] ئەمێش ئەوەیە کە کابرایەکی شارەزووری لەوێتر ئەپرسێ ، برا خوا چۆن ئەم دڕکانەی تێژکردووە ؟ ئەویش ئەڵێ : « برا ، کە ووتی تێژ ، تێژ » ٠ جا ئەمە هەرچەندە لە لێکۆڵینەوەیەکی سادەوە پەیدابووە ، بەڵام تەواو تێ‌گەیشتنی ئەو ئایەتەی قورئانە کە ئەفەرموێ : « انما أمره اذا اراد شیئا ان یقول له کن فیکون »[٩] ٠

هەندێ پەند هەیە لەپەیڕەوێکی ئیسلامەوە وەرگیراوە ، یا دیمەنێکی ژیانی موسولمانی پیشانئەدەن ٠ وەك ئەڵێ : « تا فەرز وەستابێ سونەت حەرامە »[١٠] ٠ یا کورد ئەڵێن : ( بوو بە بزنەکەی ئەخفەش )[١١] ٠ چیرۆکی بزنی ئەخفەش هەرچی‌بەلێبێت هەیە ٠ بەڵام ئەوە دیارە کە مەبەس لە ئەخفەش ، زانای گەورەی نەحوی عەرەبی‌یە ٠ وە ئەم پەندە تەواو پەندی کاتێکیشە کە کەلچەری عەرەب لەناو کورددا بڵاوبۆتەوەو زادەی بیری مزگەوتی کوردەواری‌یە ٠ شایانی باسە کە ژیانی مزگەوت‌و جۆری خوێندن‌و

گوزەرانی تایبەتیی مەلاو فەقێ ، پەندو قسەی نەستەقی زۆری هێناوەتە بەرهەم کە لە خانەی پەندو قسەی نەستەقی مزگەوتدا تۆمار ئەکرێن •

هەر لەم بارەیەوە چەند پەندێکی تر هەیە کە ئەبێ لێرەدا بنووسرێ ، وەك ئەوەی ئەڵێ : « عیسا نەبوو ، مووسا بوو ، خوا خواداری خۆی هەر ئەکرد »[12] یا وەك ئەڵێ : « کەسی بێ کەسان خوایە »[13] • ئەم دوو پەندە لەپاڵ جەوهەری قووڵێ کۆمەڵایەتیاندا ئەچنە پاڵ ئەو پەندانەی باسی تاك و تەنیایی بوونی ئەزەلی خوا ئەکەن •

وەك ووتمان ، پەندی پێشینان بەرهەمی دەوری کشتوکاڵ و پاش ئەوەیە • بۆ بەڵگەی ئەم قسەیەش ئەبێ ئەوە بزانین کە دەستدانە کشتوکاڵ و دەستدانە حەیوان مالی کردن ، لە سەرەتای پلەی کۆمەڵایەتیی مێژوودا نزیکی یەکن • بۆیە بە زۆری باسی مالات و ناوی جۆرەها ئاژەڵ ، وەك : « بزن ، مەڕ ، گا » ناوی « تانجی و سەگ و کەر و ئەسپ و ئێستر و حەیواناتی تر ، هەموو بەڵگەی ئەوەن کە ئەم پەندانە بەرهەمی ئەو پلەیەی مێژوون •

وەهەرچەندە لە پەندی پێشیناندا زۆرجار ناوی حەیوانی نامالی «کێوی»و ناوی دڕندە دێت • بەلام دیارە کە بە جۆرێك ناویان دێت کە دوورن لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەوە ، واتە پەندی کاتێکن کە کورد هاتۆتە ناو خانووبەرەو گوندەوەو تەنانەت هەندێ شاریشی دروست کردوە ، بۆ نموونە ، لە پەندی پێشینانی کوردیدا بە زۆری باسی شێر و پلنگ و ڕێوی و کەمتیار و ناوی هەندێ باڵندەی وەك قەل و هەڵۆ و باز ئەبینین • هەروەها لە پەندی پێشیناندا ناوی هەندێ گیاو گوڵە کێوی دێت ، بەلام لەویشدا دیارە کە ئەو پەندانەش بەرهەمی کاتی شارستانێتی نین • دیسان باسی دیمەنی شوانیش ئەوە دەرئەخەن کە ئەو پەندانەی لەبەر دەستماندان پەندی کاتێکن کە کشتوکاڵ هەبووە • گوند ، دێهات ، خانووبەرە هەبوە ،

یا شوانیش لــــه مێژووی کۆمەڵایەتیدا تۆزێك پێش کشتوکاڵ کەوتبێ . نموونەی ئەم قسانە لەم پــــەندانەدا ئەبینین : ( دیاری شوان یا شنگە ، یا هەڵەکۆك )[14] . ( باران ئەباری ئاشی ئەگەڕێ، باران ناباری جووتی ئەگەڕێ )[15] . یا ئەڵێ : ( بزن ئەجەلی هــات نانی شوان ئەخــــوات )[16] . ( بزنە بۆ شەوێك جێی خــۆی ئەکاتەوە )[17] . یا ئەڵێ : ( بوو بە ئاردی ناو دڕکان )[18] . ( بەرد لە جێی خۆی ســەنگینە )[19] . یا : ( تــــەور کلکی خــۆی نابڕێتەوە )[20] . هەروەها کورد ئەڵێن : ( تۆ کاڵەك خۆری یـــا پێستانڕن )[21] . یا ئەڵێ : « تۆبەی گورگ مەرگە»[22] یا «دەوەن بە ئاشە »[23] یا «ڕێوی لە کونی خۆی هەڵگەڕێتەوە گەڕ ئەبێ»[24] یا « گورگەو لە پێستی مەڕایە »[25] ، هەروەها : ( لەو جێیــە ئاو هەیە زەوی نییە ، لەو جێیە زەوی هەیە ئاو نییە )[26] . یا ئەڵێ : ( مانگـــــا مردو دۆ بڕا )[27] . یا ( ڕێوی کێ شایەتتە ؟ ووتی : کلکم )[28] . هەروەها : ( شوان بە شوانی عـــەیب نییە بەنانەوە چنینی عەیبە )[29] . یا ئەڵێ : ( چی بچێنیت ئەوە ئەدرویتەوە )[30] . یا لە چیرۆکێکی ژیانی دێهاتەوە پەندی : ( بوو بە کوردەکەی لــە هەردوو جەژنان‌بوو )[31] هاتوتە بەرهەم . هەروەها کورد ئــەڵێ : « ماڵێ پڕە لە ڕازیانەو بە دڵ یەشە ئەمرێ »[32] . ئەم پەندە دیارە کە بەرهەمی کاتێکە کە کورد فێری ئەوە بووە کە گیای کێوی بکــات بە دەرمان بۆ ئــــەم نەخۆشیو ئەو نەخۆشی . هــــەروەها لە پەندی‌پێشینان‌دا ئەتوانین دیــــــەنی وردە وردە بەرەوپێش‌چوونی ژیانی کۆمــــەڵایەتیی لادێو لە ژیانی دێهاتــــەوە بۆ شــــارو شارستانییەتی بەدی بکەین . وەك لە نموونەکانی لەمەوبەرا دیمان ، چۆن باسی جەنگەڵو دارستان‌بوو بە باسی ئاژەڵو حەیوانی ماڵێ . باسی جووتو زەوی کێلان ، باسی ئاردو ئاشی بەدوادا هات ، کــە پلەیەکی‌تری پێش‌کەوتووە لە ژیانی دێهاتا . هەروەها مێژوو ئەوەی

پیشانداوین که له ناوجەرگەی ژیانی کشتوکاڵو دێهـــاتدا تۆوی پیشەسازی له شێوەیەکی سادەو سەرەتایی‌دا سەرهەڵئـەداو وردە وردە پەرەئەسێنێو وەك هەموو وولاتانی جیهان گـــەشەئەسێنێو کۆمەڵ بەرەو پیشەسازی‌ئەبات • نموونەیەکی ئەم تۆوە سادەیە له پەندی پێشینانی کوردیدا دیارە • بۆ نموونه له دیمـەنی « جۆلا »و « شتچنین »و بارو بەرهەم ڕوەو شارهێنانو له ناوی « چـەك »ی کوردیدا دەرئەکەوێ •

وەك دیمان هەر دوا بە دوای کشتوکالاو لەگەڵ دەســتدانە نانکردنا ، ئادەمیزاد پێویستی‌ی بە « ئاش » دروســــتکردنو گەنمهاڕین‌بوو ، ئەم ڕووداوە دیارە پاش دەستدانە کشــتوکالە • وە هەروەك ئەمە دیمەنی بەرەوپێش‌چــوونی ژیانە ، هەروەهـــا خوری‌ڕستنو چنینو جۆلایی پلەیەکی‌تر لـــە پێش‌کەوتنی ژیانی ئادەمیزاد له دێهاتاو سەرەتایەکی سادەی پیشەسازی پیشانئەدەن • بەلکو له هەندی وولاتا جۆلایی‌و ڕستنو چنین چــــەشنێکن له « مانیفاکتۆرە » • له پەندی پێشینانمانا ئەم دیمەنە ئاشکراو دیارەو بە دەیان پەند هەیە که لـــــە پاڵ مانای قوولی کۆمـــەلایەتی‌یدا کەرەسەکەشی لەم هەنگاوەی ژیانەوە وەرگرتوە • بۆ نموونە کورد ئەڵێن : ( ریسەکەمان بۆوە بە خوری )[٣٣] • یا : ( تۆم کرد بە جۆلا مەکۆم بدزی )[٣٤] •

له پەندی پێشینانمانا دیمەنی ئەو کاتەش ئەبینین که بەرهەمی کشتوکاڵ براوەتە شارو بە شێوەی ڕێکوپێكو سەرپەرشت کراو ، له ژێر چاودێری‌دا فرۆ شراوە • بۆیە ئەبینین له پـــــەندێکدا باسی باجسەندن ئـــــەکرێت • کورد ئـــەلێن : ( بارت بگرەو باجت ببێنە )[٣٥] • ئەم بەرەوپێش‌چوونە له هەندێ پەندی‌تردا دیمەنی‌تر پیشانئەدەن وەك ئەلێ : ( سواڵ کیمیایە )[٣٦] • جارێ سواڵکردن خۆی دیمەنی ژیانی ناوشارە • مەبەسیش بە کیمیا ، زانستی کیمیای

پێش « لاڤوازیه »یە کەوا مەبەسی کیمیاگەران ئەوە بووە کــە ڕە نەزی هەرزان بکەن بە زێڕ • دیارە ئەم پەندەش نیشانەی ئەوەیە بە کورد لە کاتی خۆیدا ئاگاداری ئەم جۆرە کارەی زانستی کیمیابووە•

لــە باسی « چەك »دا دیمەنێکی تری بەرەوپێش چــوون ئەبینین • لە باسی چەکی کۆندا کورد ئــەڵێن : ( تیرێك و دوو نیشانە ) • لە پاشــدا « شیر »یش دێتە کایەوەو ئــەڵێن : ( تیرو شیر لەیەك ئەسوون )[٣٧] • لەم دواییەدا تفەنگیش دێتــە ڕیزەوەو ئەڵێن : « تفەنگ بە تاریکی یەوە ئەتەقێت »[٣٨] •

لە باسی « پارە »دا پــەندی پێشینان پەردەیــەکی تری بەرەوپێش چوونمان پیشان ئەدات • لــە زانستی « ئیکۆنۆمی ــ اقتصاد »دا پارە بە چەند پلەیەکدا ئەڕوا • یەکەمیان ئەوەیە کــە پارە هۆی ئاڵوگۆڕە • دواشت پارە ئەبێتە هــۆی کڕین و فرۆشتن واتە ئەبێ بە « عملە » • لە پەندی پێشینانی کورددا پارە هــەر وەك « عملە » دیارە •

## تەماشاکردنێکی قووڵی پەندی کوردی

پەندی پێشینانی کوردی ــ وەك ووتمان ــ بەری تــەجروبەو دنیادیدەیی گەلی کوردە • لە هەموو مــەیدانێکی ژیانا ، تاڵی و ترشی ، هەوڵدان و چەرمەسەری ، ژیری و ووریایی لە هــەموو کوچەیەکی ژیانا •

لەم پەندانەدا شەقڵی تایبەتیی زوربەکەی گەلی کــورد دیارە ، ئەوی بە ڕەنجی شانی ئەژی و بە ئارەقی ناوچەوانی نانی پــەیدائەکات و فەلسەفەی ژیانی هەوڵ و کۆششە ، دوژمنی ئەوەیە کە تەمەڵی و لــە سای سێبەردا دانیشتن و لەسەر ورگی خەڵك بوونە زەڕو ببێتــە پەڕەوی ژیان • وێنەی ئەم فەلسەفەیە لەم پەندانەدا ئەبینین : « تێر ئاگای نیەیە لە برسی »[٣٩] • « کردەی منــەو بردەی تۆ »[٤٠] ، بۆ کوردی هەژار ، چ گورگ بێ چ سوار[٤١] ، یاخود کورد ئەڵێ : « بــە

حوشتریان ووت کـــــورت بوو ، ووتی باری خـــۆم لەسەرپشتی خۆمە »[٤٢] • هەروەها کورد ئەڵێن : « فەقیر ئەیەڵێ لە ئاش بێتەوە ، دەولەمەند نایەڵێ لە ساج بێتەوە[٤٣] • یا ئەڵێ « دنیا بەهەشتی بلحانە ، گاهێ بنو ، راهێ بخو »[٤٤] •

یا لەم بارەیەوە بە سووکی تەماشای پیاوی ئیش نەکــــەریان کردووەو ووتویانە : « حازرخۆری بەرسێبەرە »[٤٥] •

کورد ئیش کردنی زۆر لا بە نرخەو بە چاوی بەڕێزیو بەرزی یەوە ئەڕوانێتە ئیش کردنو ئارەق ڕشتن • بۆیــە پێشینان ئــــەڵێن : « دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە »[٤٦] • یا « هەر کـــەسێك پەڕی تاوسی ئەوێ ، ئەبێ زەحمەتی سەفەری هیندستان بکێشێ» [٤٧] •

کورد بە بەرزی یەوە تەماشای پیـــاوی زەحمەتکێشیان کردووەو دڵنیایی یان پیشانداوە کە دوارۆژ ژیان هەر بۆ ئەوە ، بۆیە ووتویاتـە «سەری بێ رزق لە ژێر خاك دایە»[٤٨]• یا ئەڵێ «ئەگەر جوتیار،جوتیار بێت ، لەسەر شاخی جووت دەکا )[٤٩] ، ئەم پەندە لە پاڵ بەبەرزگرتنی ڕەنج کێشاندا بایەخدانی تەواویشە بە هیمەتی مەردانەی ئادەمیـــزادو نرخ پێدانی هونەرو پسپۆڕی یە • هەروەها لەم بارەیەوە کورد ئەڵێن « هەموو کەس نانی خۆش ئەوێ ، وەك شوان نای گرێ بەســـــەر دڵی یەوە »[٥٠] ، دیارە نان لای شوان بۆیە خۆشەویستە چونکــــــە ڕەنجی بۆداوە • وە هەر لەم بارەیەوە ووتراوە : « گۆشــتی لا ڕانم ئەخۆمو منەتی قەساب هەڵناگرم »[٥١] • یا بەو پەڕی دڵنیایی یەوە لــە ئەنجامی ئاسودەی ڕەنج کێشو ئەنجامی ڕەشی پیاوی زەرو سروشت ووتویانە : « ئەوی بە تەمای ماڵـــــە دراوسێ بێت بێ شێو ســـەر ئەنێتەوە »[٥٢] • وە ئەم پەندە مانا فراوانەکـــەی لە سنووری ڕەنج کێشان ئەچێتە دەرەوەو ئەتوانرێ لە کۆڕی ژیاندا بکرێ بە بەڵگــەی ئەوەی کە ئەبێ مرۆڤ پێش هەموو کەس ، لە کاری خۆیدا پشت بــە خۆی ببەستێ •

یا ئەڵێ « دەوڵەمەندی بە دڵە بە ماڵ نییە ، گەورەیی بە عەقڵە ، بە ساڵ نییە »[٥٣] . لێرەدا هەرچەندە پەسندیی دڵباشیو عەقڵو ژیریش کراوە ، بەڵام دیارە فەلسەفەی پێشینانمان ئەوە بووە کە پارە کۆکردنەوە پیاو دەوڵەمەند ناکات ، بەڵکو دەوڵەمەندی ئەوەیە کە پیاو خاوەنی گەنجینەی دڵی باشو رابوردووی باشو خزمەتی باشی کۆمەڵبێت . ئەو فەلسەفە قووڵەی پەندیپێشینان کەوا بەم جۆرە ئەڕوانێتە ڕەنجکێشان زۆر بە وردیو ژیریو تێبینانە دوارۆژی ئەو خەڵکەش ئەبینێ کە ئەیانەوێ بەکارکردن نەخشەی دوارۆژ بکێشن . بۆیە پەندیپێشینان ئەڵێ : « هەر دەوەنە ئەبێ بە دار ، لە بنیا دائەنیشن فەقیرو هەژار »[٥٤] . پێشینانمان کە ئەم فەلسەفە وردەیان هەبووە بەرامبەر بە ژیان ، دیارە دوژمنی سەرسەختی زۆرداریو زوڵمکردنیش بوون . دەیان پەندی وا ئەبینین کە فەلسەفەی سەختو نەلەرزیوی خەڵکە بەرامبەر بە خراپەو زوڵمکردنو ئەنجامی زۆرداریش لە پەندی پێشینانماندا هەر ئەمانە . کورد ئەڵێن: « زاڵم زەواڵی بۆ ئەبێ »[٥٥] یا « سەگی هار چل شەوی عومرە »[٥٦] یا ئەڵێن : ( بەبێکینی زاڵم باوەڕ مەکە )[٥٧] . وە هەر لە خانەی باوەڕ بە زاڵمو پیاوخراپ نەکردنایە کە کورد ئەڵێ : ( تۆبەی گورگ مەرگە )[٥٨] . یا ئەڵێ : « شەرعی مار بە دار »[٥٩] . یا « گورگەو لە پێستی مەڕدایە »[٦٠] . یا « زۆردار ئاوی سەرەو ژێر دەروا »[٦١] .

لە پەندیپێشینانی کوردیدا بە سووك تەماشاکردنی هەموو کردارێکی ناڕەواو ناشیرینی ناو کۆمەڵ ئەبینین . ئەو ڕەفتارانەی لە گیانی ڕاستەقینەی گەلی کوردەوە دوورن . بۆ نموونە ، کورد زۆر دوژمنی ڕژدیو ڕەزیلییە ، بۆیە پەندیپێشینان ئەڵێ : ( ماڵی خۆ نەخۆر بۆ چەکمەبۆر )[٦٢] . یا « ڕژدی ڕیسوایی لە دوایە »[٦٣] . هەروەك کورد دەربارەی درۆزنی ئەڵێن : ( درۆزن دوژمنی خوایە )[٦٤] . یا « درۆزن هەرجارێك ناشتائەکات »[٦٥] . هەر لەسەر

ڕەفتارو ڕەوشتی ناشیرینی ناو کۆمەڵە کە کورد ئەڵێن : ( ئەگەر گوێ نەبیت ، دڕکیش مەبە )[٦٦] • یاخود : ( زمان بوەستێ سەر زۆر ڕەحەتە )[٦٧] •

گەلی کورد زۆر هەقپەرستو هەقخوایە ، بۆیە لە پەندیپێشیناندا ئەڵێ : هەق ئاو ڕادەوەستێنی[٦٨] • یا : هەق بە هەق ، نانێکی ڕەقو تەڕ • ئەم پەندەیان زۆر دیار نی یە کە لە کەیەوە هەیە • بەڵام لە ووشەی « هەق »دا کە لە « حق »ی عەرەبییەوە وەرگیراوە ، دەرئەکەوێ کە بەلای کەمەوە پەندی پاش ئیسلامو تێکەڵاویمانە لەگەڵ عەرەبدا • هەرچەندە پەندەکە خۆی لە جەوهەردا تەواو وەرگێڕانی پەندێکی یاسا کۆنەکەی حەمورابیی شای بابلە کە ئەڵێ : ( دان بە دانو چاو بە چاو ) • واتە هەقی خۆت بەسەر کەسەوە مەهێڵە •
کورد دوژمنی دووزمانیو نێوانی خەڵك تێکدانو ئاژاوە نانەوەن ، بۆیە لە پەندیپێشینانا وێنەیەکی سامناکیان بۆ خاوەنی ئەم ڕەوشتانە کێشاوەو ووتویانە : ( زمان بوەستی سەر زۆر ڕەحەتە ) • واتە زمان نەوەستان ، نەك تەنیا سەرئێشەشی لە دوایە ، بەڵکو سەر لەناوچوونیشی لە دوایە •

کورد زۆر دوژمنی هەڵپەرستیو ڕاڕاییو ڕیاکردنن • بۆیە لە پەندیپێشیناندا وێنەیەکی کۆمیدیو پڕ لە پێکەنین بۆ پیاوی هەڵپەرست نەخشەکێشراوەو ووتویانە • ( وەك پەشتەماڵی حەمام وایە ، هەر دەم بەبەر یەکێکەوەیە )[٦٩] •

هەر لەم بارەیەوە ئەتوانین بڵێین کە کورد ڕاستگۆیییان لە قسەداو سەرڕاستییان لەئیشدا لا پەسندبووەو بە مایەی سەرکەوتنیان داناوە بۆیە ووتویانە : ( ڕاست بەو بەلای شێرا بڕۆ )[٧٠] واتە لە هیچ کەس مەترسە • هەروەها ئەوە ئامۆژگارییان بووە کە پیاو لەسەر ئیشی خۆی سووربێتو ووتویانە : « دڵۆپە ئاسنیش کون ئەکات »[٧١] • ئەم پەندە بەرپەچیی ئەوانەش ئەداتەوە کە

هەولی پیاوی بچووك بەشتنازانن ، بەڵگەیەکیشە بۆ ئەوەی کە ئەبێ ئادەمیزاد لە هەوڵو کۆششدا بینی فراوان بێتو زوو وەڕس نەبێت ، وە پێشینان لەم بارەیەوە ووتویانە : « کەسێ لە پڕێك نابێتە کوڕێك »[72] • یا ووتویانە : « لیرەش بچووکە »[73] •

کورد لە پەندیپێشینانا گەلێك وێنـەی نیشتمانپەروەریو گەلپەروەریشی نەخشەکێشاوە • دوژمنی باوك کوشتەی کەسێکە کە پشتئەکاتە گەلەکەی خۆی • لەم بارەیەوە با بڕوانینە ئەم پـەندانە : « ڕیوی لە کونی خۆی هەڵگەڕێتەوە گەڕ ئەبێ »[74] • ئـەم پەندە هەر وەك وێنەی نیشتمانپەروەرییـە ، وێنـەی شانازیی مرۆڤی کوردیشە • بە بنچینەی هەزارو ڕەنجدەری خۆیەوە • هەروەهـا کورد ئەڵێن : « هەزار ساڵبکەیت بێگانەپەرستی ، دوایی هەر ئەهێنی نشوستی »[75] • یا ئەڵێن : « دار کرمی لە خۆی نەبێ هەزار سـاڵ ئـەژی »[76] ، یا ئـەڵێن : « دار پوازی لە خـۆی نـەبێ ناقڵیشێ »[77] • هەر لە کۆڕی شانازی بە نیشتمانو شوێنـەواری باوكو باپیرەوەدا کورد ئەڵێن : « بەرد لە جێی خۆی سەنگینە »[78] • واتە : کە لە ناو وولاتو نەتەوەو کۆڕی خۆتا نەمایت ، ئیتر ئـەو نرخەی جارانت نامێنی • هەر ئەو وێنەی نیشتمانپەروەرییە وا لـە کورد ئەکات کە سەربەرزانە ئاوڕ بداتەوەو بڕوانێتـە چیاکانی دەوروپشتیو بڵێ : « پشتم سەفینێت ، تف لە ئاسنیش ئەکەم »[79] • هەر لەم مەیدانەشدا ئەڵێن :[80] « ئاو ببڕێ لە ڕۆخـانە ، خۆ نابێت بە بێگانە »[81] •

کورد پشتگری پیاوەتیو مەردایەتیو چاکەکردنن • بۆیە لـە دەیان پەندا پـەسندکردنی ئەم ڕەوشتانەو بە سـووك بینینی پێچەوانەکەیان ئەبینین • کورد ئەڵێن : « ئاو بتبا لە پردی ، نامـەرد مەیەرەوە »[82] • یاخود ئەڵێن : « ئەگەر گـوڵ نیت دڕکیش مەبە »[83] • یا پیاوی باش پەسندئەکەنو ئەڵێن : « ئەوەند شیرینە

بەقوزەلقورتیشەوە ئەخورێ »[٨٤] .

هەر لە پەسندیی چاکەدا ئەڵێن : « چاکــــە بکەو بیـــــدە بە دەم ئاوەوە »[٨٥] . لە مەیدانی چاکەدا کورد باسی بەخشندەیی ئەکـــەنو ئەڵێن : « جۆگەیەك ئاوی پیابڕوا زەحمەتە ووشك بێ »[٨٦] .

کورد فەلسەفەی چاکەو خزمەتکردنو ڕەوشتی باش نواندن لە چوارچێوەی تاقە پەندێکدا کۆئەکاتەوەو ئەیکات بە سنوور بۆ بەرەو دەستەی چاکە لەگەڵ بەرەو دەستەی خراپەد ، بەڵکو وەك لە زانستی فەلسەفەدا ( هۆ ) هـــــەیەو ( ئەنجام ) هەیەو ئەنجام لـــە هۆوە پەیدائەبێت ، کوردیش ئەم فەلسەفە قووڵە لە پەندێکدا کۆ ئەکاتەوەو ئەڵێ : « چی بچێنیت ئەوە ئەدروویتەوە »[٨٧] .

کورد وێنەیەکی قووڵو جوانو ڕەنگین ، بەڵکو نەخشــــە یەکی تەواو بۆ فیداکاریو لەخۆبوردنو لە پێناوی دەوروپشتا هـــــەوڵدان نەخشەئەکێشێ . پەندیپێشینیانی کورد ئەڵێ : « چراشـــــەوقی بۆ خۆی نییە »[٨٨] .

گەر لە پەندی هەندێ گـــــەلی دراوسێدا پیـــــاوی فیداکارو خزمەتگوزار کرابێت بە مۆم بۆ خەڵکی بسووتێ ، ئەوا ئەبینین کــە کورد کردوویەتی بە چرایەك کە هەمیشە ئەسوتێو شـــەوق‌ئەداتەوە ، ڕێگە بۆ هەمووان ڕووناك ئەکاتەوە ، بێ ئەوەی خـــۆی شتێك لەم شەوقو ڕووناکییەی خۆی ببینێ ، یان ئەم شـــــەوقو ڕووناکییە سوودێکی بۆ خۆی هەبێت .

هەر لەم باسەدا ئـــــەتوانین لەوەش بدوێین کە کورد هـــــەروەك ڕاستگۆو سەرڕاستن ، هەروەها هاوپشتی ئەوەن کە پیاو بە کردار ، نەك بە قسە ، پەسندی و بەرزیو کرداری باشی خـــۆی بسەلمێنێ ، بۆیە ئەڵێن : « بە ڕیش نییە بە ئیشە »[٨٩] . هەر لە باسی ڕەفتـــاری جوانـدا پەندێکی بەناوبانگ هەیە کە لـــە قووڵیو جوانیو ڕەوانیدا بەیەکەرێکو وێنەیەکە . کورد ئەڵێن : « دڵ ئاوێنـــــەی دڵە »[٩٠]

ڤوولی پەندەکە ئەوەیە کە دڵی مرۆڤ بە شتێکی پاکو بێ گەرد ئەزانێت وەك ئاوێنە ، ئەو ئاوێنەیەش دڵی هەموو مرۆڤێك ، هەموو کوردێکە کە ئەبێ بەرابەر بە یەك پاکو بێ گەرد بێت ، جوانی پەندەکەش لە ڕووی زمانو دارشتنەوە دیارە • ئەم پەندەو چەندین پەندی تر ئەوە دەرئەخەن کە کورد لە سروشتی نەتەوەیی خۆیدا ، لە مێژوویدا ، لە ژیانی ڕۆژانەیدا دڵپاکو بێ گەردە ، دڵپاکیو خۆشەویستی کردووە بە ڕابەری ژیانی • هەر لە پەندیپێشینیانەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە کورد لە فەلسەفەو تەجروبەی سالەهای ژیانی خۆیدا دڵپاکیو خۆشەویستی نەخستۆتە چوارچێوەی شوێنو کاتێکی تایبەتیەوە ، بەلکو لە هەموو شوێنو کاتدا خۆشەویستی ڕابەری ژیانی بووە • کورد ئەلێن : ئەو شوێنە خۆشە ، کە دڵ لێی خۆشە»[91]• کەواتە لای کورد کاتێکو لە شوێنێکدا خۆشی ئەبینرێ کە دڵ تیایا خۆشبێت ، دڵیش هەروەك لە پەندیپێشینیاندا دیسان ، ئاوێنەبوو ، وێنەی پاکیو سەرراستیبوو ، بۆیە لە هەر شوێنێکدا ئەم نرخو ڕەوشتانە سەرکەوتووبن ئەوا دڵ خۆشە ، پەندیپێشینیانی کوردی گەلێك سروشتیتری کورد دەرئەخات ، بۆ نموونە ، لە پەندی کوردیدا وێنەی ئازاییو مەردایەتیو ، دوژمنی پیاوی ترسنۆکو ورەبەرداو بە ڕۆشنی دیارە ، هەر ئەو کوردەی ووتویەتی : « پشتم سەفین بێت ، تف لە ئاسنیش ئەکەم »[92] • ووتووشیەتی : « ئەوی بترسێ ناخەلەسێ »[93] • هەروەها کورد ئەلێن : « ئەگەر لە جافان یەکێك ببینی ، هەقی بەرەودوا لەگشت ئەستێنی »[94] دیسانەوە ووتویانە : « ڕۆژێك بە کەلەشێری ، هەزار ڕۆژ بە مریشکی مەژی »[95]•هەروەها « مەنجەلی مەردان بە چل ساڵ دێتە جۆش»[96] واتە پیاوی ئازا چەند خۆی بەرابەر زوڵمو زۆر ڕاگرێ ، چەند داخو کینە لە دڵیا پەنگ بخواتەوە • دوایی هەر خۆی ناگرێتو مەردانە دێتە کایەوە •

لەم بارەیەوە کورد هەمیشە لەگەڵ پیاوی ئازاو لەخۆ بوردووانو کەسێك خۆی دوورەو کەنار گرتبێ بەلایانەوە خراپــــە • پێشینیان وتویانە : « سەرێك لەناو سەرانا نەبێت ، بۆ بڕین چاکە »(٩٧) هــەر لەم بارەیەوە پێشینیان ئەوەیان خستۆتە پێش چاو کــــــە ئادەمیزاد هەرکارێکی کرد ئەبێ ئەنجامەکەی لەبەر چاوبێتو خۆی بۆ فیداکاری لە پێنـــــاوی‌دا ، ئامادە بکات ، بۆیە ووتویانە : « ئینسان لــــــە بن کوورەدا بێت پریشکی لێ ئەپرژێت »(٩٨) • وە هــــــەر لەم مانایەدا ووتویانە • « گۆزە هەموو جارێك بەساغی لە کانی ناگەڕێتەوە »(٩٩) چەند پەندێکی‌تر هەیە کە لەم مانایەوە نزیکن ، وەك ئەوەی ئــەڵێت : « ڕیش نەبێت بــــە تووشەوە ، کــــە پوو ئــــەبێ شــــانەی بۆ هەڵگریت »(١٠٠) •

بۆ بەڵگەی ئەم باسەو باسی تەجروبەو دنیا دیدەییش ئەتوانین ئەم پەندەش بکەین بەنموونە کە ئەڵێت : « سوار تا نەگلێ نابێت بــــــە سوار »(١٠١) • پەندی پێشینیان لەپاڵ ئەم هــــــەموو ڕەوشتی جوانو ڕەفتارە پەسندانەی کوردا پیاوچاکی‌و بە شەرەفی خەڵکی ســــــادە دەرئەخاتو ئەوە ئەخاتەڕوو کە پیاوخراپ بەرەونەمان ئەڕواتو لــــــە ئەنجامدا هەر دووچاری خراپەش ئەبێت • پێشینیان ئەڵێن : « هــــەر کەسێك چاڵی بۆ کەسێك هەڵکەند خۆی تێ ئەکەوێ »(١٠٢) • بێ گومان ئەم پەندە تەنها لە کوردی‌دا نی‌یە بەڵکو لای گەلێك نەتەوەی جیهــــان هەیە ، ئەمەیان هاوبەشی‌و هاوسانی خەڵکی دڵپاكو سادەی ئێمــــــە لەگەڵ هەموو دڵپاكو پیاوچاكو ڕەفتار جوانی ئەم سەر زەوی‌یــــەدا لە سروشتو ڕەوشتیان‌دا دەرئەخەن • پەندی‌پێشینیانمان لــــــە پاڵ ئەمانەش‌دا وەفاداری‌و ئەمەكداری‌و چــــاکە لەبەر چــــــاوی کورد دەرئەخات • گەلێك پەندمان هەن کە بەڵگەی ئەم سروشتە بــــەرزەی کوردن ، ئەو سروشتەی کە شەقاێکی تایبەتی مێژووی نــــەتەوەی‌مان

بووه ، بۆ نموونه کورد ئەڵێن : « کاتی‌یەك ئاوی لێ‌بخۆیتـــەوه ، بەردی تێ‌فرێ‌مەده »[١٠٣] .

پـــەندی پێشینانی کـــوردی هـــەروەك تابلۆیەکی ڕەنگینی نیشتمان‌پەروەری پیشان‌داین هەروەها نزیك لەو مەبەستەوه دیسـەنی پەرۆش‌و بە تەنگـــەوه هاتنی دۆست‌و خزم‌و کـــەس‌و کاریشمان پیشان‌ئەدات ، کە ئەمەش وێنەیەکی ژیانی کۆمـــەڵایەتی کوزده لە پلەیەکی تایبەتی مێژووی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌دا .

کورد ئەڵێن : « پاروو لەدەم د کەوێت ، بۆ کۆش باشە »[١٠٤] .

یان ئەڵێن : « خێر بۆ خوێش ، نەك بۆ دەروێش »[١٠٥] .

قسەیەکی تری کوردی هەیە ئەڵێت بوه بە مامەخەمە ، واته بـــه خەم‌خواری ئەو خەڵکەو لەگەڵ دەردو ئازارو کارەساتی هەموو کەس‌دا ئەتلێتەوەو دەربەستی هەموو کەسە .

هەرچەندە کورد حەز بە ئازایەتی‌و مەردایەتی‌و پیـــاوەتی ئەکەن بەڵام هەروەك مێژوو دەری‌خستووه نـــەتەوەی کورد هیچ‌کاتێك شەڕانی‌و ئازاردەرو خوێن‌ڕێژ نەبووەو هەمووکات حەزی بە ئاشتی‌و هێمنی‌و ئاسودەیی‌کردووه . پـــەندی پێشینیان بەڵگـــەیەکی ئەم ڕاستی‌یەش ئەدا بەدەستەوه ، کورد ئەڵێن « ئاشتیی دوای شـــەڕ خۆشە »[١٠٦] . یا ئەڵێن : « دوای شەڕ ئاشتی‌یە »[١٠٧] . بەڵکو زۆر لەمە قووڵتر ئەڕواننە باسی ئاشتی ، بەوەی کە شەڕ بـــە ڕووداوێکی نەمر دانانێن لە ژیانی ئادەمیزادا ، بەڵکو بە شتێکی ئەوتۆی ئـــەزانن کە دێت‌و ئەڕوات‌و لەناو ئەچێت ، بەڵام ئاشتی‌و هێمنی بـــە شتێکی هەمیشەو زیندوو و جێگیر دائەنێن لە ژیانی ئادەمیزادا . بۆیە کورد لە کاتی شەڕدا هەمیشە ئاشتی لە بیرەو ئەڵێ : « شەڕ کەر ئاشتیت لـــە بیر بێت »[١٠٨] . یان لـــە کاتی شەڕدا ئەڵێن : « بـــەشی ئاشتی تیا بهێڵەرەوه »[١٠٩] .

هەروەها پەندی پێشینان ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە کورد زۆر بە قوولی لەو ڕووداوە گەیشتوە کە پێی ئەڵێن جەنگ . کورد ئەڵێن : « کاسەی پڕ ئاشتی ماڵە »(۱۱۰) . واتە کاتێك کاسە لەماڵدا ، لە وولاتدا ، لەم زەمینە پانو بەرینەدا پڕبوو ، ئەوسا ئاشتی ماڵ دێتەکایەوە ، ماڵیش بۆ خێزان خانووە ، بۆ نەتەوە نیشتمانێکی سنووردارە ، بۆ مرۆڤایەتی سەرزەمینە ، بەڵکو ئاسمانو ئاسمانی بەرینە . پێشینان بە سادەیی ، بەڵام بە ووردیو قوولیو ژیری لە فەلسەفەی جەنگ گەیشتوون . فەیلەسوفو زانایانی ئەمرۆ نەمانی جەنگ لە ژیانی ئادەمیزادا ئەبەستن بە نەمانی ڕژێمی ئیمپریالیو نەهێشتنی چەوساندنەوەوە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا ، ئەم پەندەی پێشینانی ئێمەش لە ڕەگی فەلسەفیدا بە تەواوی ئەچێتە سەر ئەو جۆرە لێکدانەوەیە .

لە باسی هەندێ بەشی فۆلکلۆری کوردیدا ووتمان کە ڕۆژهەلاتناسان زۆر بەڵگە لە فۆلکلۆری کوردیەوە وەرئەگرن بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کەوا کورد ژنی لەلا بەرێزەو بە بەرزیەوە ئەڕوانێتە ئافرەت . لە مێژووی کورددا ( بەتایبەتی لە مێژووی ژیانی کۆمەلایەتیو ئابووریدا ) ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە ئافرەت بە زۆری هاوشانی پیاو بووە لە ئیشکردنو لە ژیانی کۆمەلایەتیدا ، بەڵگەی ئەم قسانەش لە پەندی پێشینانەدا ئەبینین . کورد ئەڵێن : « ژن کۆلەکەی ماڵە »(۱۱۱) .

ئەم پەندانە ژن لە سنووری ماڵ ئەبەنە دەرەوە بۆ ناوسنووری کۆمەڵو بە شێوەیەکی ژیرانە ئەڕوانە ئافرەتی باشوە بە بناغەی بەختیاری کۆمەڵی دائەنێن . کورد ئەڵێن : ژنیش هەیەو ژانیش هەیە ، واتە ئەوی باش بێت لای کورد ئەوە ژنی ڕاستەقینەیە .

لە ژیانی ئابووری دێهاتدا ، کورد ئافرەت بە بناغەو کۆلەکە دائەنێتو ڕۆڵێکی گەورەی لەو مەیدانەدا ئەداتێو ئەڵێ : ژنێکم ئەوێت ژنانە ، پێستە بکا بەهەمانە(۱۱۲) . لەپاڵ ئەمانەدا ئافرەت لەلای

کورد وینەی شەرف‌و مەردی‌و سەرفرازی‌یە ، کورد ئـــەڵێن : ( کچ قەڵایە ناگیرێ )[113] •

وە لە مەیدانی ئازایەتی‌دا کورد شانازی بە ژنیشەوە ئـــەکات ، پێشینان ووتویانە : « شێر لە بێشە دەرچێت ، چ نێربێ‌و چ مێ »[114] •

هەروەك پەندی پێشینان لای هەموو نەتەوەیەکی جیهان بەرهەمی دنیادیدەیی‌و زەدەی تەجروبەیەکی درێژی ژیانە ، هەروەها سـەختی‌و ئالۆزی‌و هەمەڕەنگەیی ژیان پێش هەمووشت وای لـە کورد کردووە کە بە ووردی‌و قوولی لە سەرچاوەی ژیان‌بکات‌و فەلســــەفەیەکی جێ‌گیری بەرامبەر بە هەموو ڕوخســـاری ژیان‌و کوڕی گوزەران‌و هەڵسووڕانەهەبێت • کورد بـــــە سادەیی‌و ساکاری ناڕوانێتـــە ڕووداوەکانی ژیان بەڵکو هەموو ڕووداوێك ئەبەستێ بە ڕێگەکەیەوە، کورد ئەڵێن : « ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە »[115] • واتـــە ڕووداو بێ جەوهەر نی‌یەو ئەنجامیش لە هۆیەکەوە پەیدابووە • گەر سادەتر لــەم پەندە ووردبینەوە ئەزانین کە کورد ژیرانە تەماشای سەرچاوەی هەموو ئیش‌و کارو ڕووداوێکی کردووە،تەجروبەی ژیان تێی گەیاندوە کە بە دیمەن هەڵنەخەڵەتێ‌و بچێتە بنج‌وبناوانی ئیشەوە • کورد ئـــەڵێن : « ئەم کاسەیە بێ ژێر کاسە نی‌یە »[116] • واتە هــــەموو ڕووداوێکی ژیان بناغەو سەرچاوەو ڕەگێکی هــــەیە ، لە ژیانی کۆمـــەڵایەتی‌و ئابووری‌داو هەرگیز ناگونجێ دیمەنێکی ژیان بێ بناغەو ســـەرچاوە بێت •

با لـــــەم بارەیەوە ووتراوە « گیا[117] لەســــەر بنجی خۆی ئەڕوێ »[118] وە هەر ئەم پەندە لە شێوەی تەوسدا کراوە بە پەندێك کە ئەڵێ : « ئەوی لە مشك بێت جەواڵ ئەدڕێ »[119] • ئـــەم شێوەی تەوس‌و گاڵتەپێ‌کردنە لە زۆر پـــەنددا ئەبینرێ کە هەر یەکـــە بۆ مەبەستێکی ئاشکرا بەکارئەهێنرێ وەك ئەڵێ « خوا غەزەب لە مێرووله بگرێ باڵی لێ‌پەیدائەکات »[120] • یا « لە شوێنێکی مەلای نەبێ بـــە

کەلەباب ئەڵێن بلقاسم[١٢١] . هەروەها ووتراود « کە کەس لەماڵ نەبوو رەجەب سەرپاڵەیە »[١٢٢] . ئەمە بۆ شوێنێکە کە ئیش بدرێتە دەست پیاوی لێنەهاتوو ، وە هەر لەم بارەیەوە ووتراوە : « گەر لە بێشە شێر نەما ، گورگ‌و مامڕێوی ئەکەونە سەما »[١٢٣] یا ئەڵێن : « پشیلە لەماڵ نەبوو مشکان تلی‌لی‌یانە »[١٢٤] یا « کیزێ هاتە ڕیزێ »[١٢٥] .

پێشینان دەرسێکی بە نرخی ژیانیان بۆ بەجێ‌هێشتووین‌و ئەوەیان تێ‌گەیاندووین کە بە چاوێکی کراوەوە بڕوانینە ژیان‌و باش ئاسۆی دوارۆژ ببینین‌و دۆست‌و دوژمن بناسین ــ بۆیە ووتویانە : « ئەو چاوە کوێر بێت کە خەنیمی خۆی نابینی »[١٢٦] . یا ئامۆژگاریی ئەوەیان کردووین کە بە فروفێل هەڵنەخەڵەتێین‌و ئەوە بزانین کە « دۆست ئەوەیە ئەتگرێنێ[١٢٧] ، دوژمن ئەوەیە پێت‌ئەکەنێنێ »[١٢٨] ، هەر دەربارەی هوشیاری‌و لە فروفێڵ گەیشتن ووتوویانە « ئەو خورمایەی تۆ ئەیخۆیت دەنکەکەی وا لە گیرفانی مندا »[١٢٩] .

تەجروبەی دوورو درێژ وای لە خاوەن پەند کردوە کە لە سەرەتای کارەوە لە هەموو کارێك بگات‌و ئەمەش لە پەندێکدا دابڕژی‌و بڵێ « تاریکی‌ی مانگ ، سەر لە ئێوارە دیارە »[١٣٠] هەر لە کوڕی تەجروبەو لە چاك‌و خراپ گەیشتندا[١٣١] پێشینان ووتویانە : « بە زستان جارێك ئەڵێن[١٣٢] ساردە »[١٣٣] یاخود « مارانگاز لە خشەی مرو ئەترسێ »[١٣٤] . هەرنزیك لەم مانابەشەوە پێشینان ئامۆژگاریی ئەوەیان کردوە کە لە کاردا پشت بە خۆمان ببەستین‌و خۆمان بە دوای دەرمانی دەردو ئازارمانا بگەڕێین ، چونکە بە تەجروبە لەوە گەیشتوون کە « تا ماڵ وەستا بێ ، مزگەوت حەرامە »و[١٣٥] خاوەن ماڵ باشتر لە کاروباری ناوماڵی خۆی ئەگات بۆیە ووتویانە « بە هەزار حەکیم بە قەدەر دەردەدارێك نازانن »[١٣٦] .

کورد باوەڕی بە پسپۆری‌و لێهاتوویی هەیەو ئەوەی زانیوە کە

هەر کەسە ئیشی خۆی هەیە ، بۆیـــــە ووتویەتی « نان بۆ نانەواو گۆشت[١٣٧] بۆ قەساب »[١٣٨] ، وە هەر نزیك بەم مانایە داوای لـــە هەموو کەس کردوە کە خۆیان بناسن‌و هەوڵو تەقـــەلایان بە پێی توانای خـــــۆیان‌بێت ووتویانە « بـــە قەد بەڕەی خـــۆت پێت ڕاکێشە »و[١٣٩] ئەوەشیان پیشان‌داوە کە هەر کارە سنووری خـــۆی هەیە ، بۆیە ووتویانە « هەموو شت بە خوێ‌و خوێش بە مەعنا »[١٤٠] .

پـــەندی‌پێشینانمان گـــەلێك تەجروبەی‌تری ژیان ژیرانـــە پێشان‌ئەدات . ئەم پەندانە هەریەکە ئەنجامی تەجروبەیـــەکن ، کورد ئەڵێن : « چەپڵە بە دەستێك لێ‌نادرێ »[١٤١] ، یا ئـــەڵێن : « جام ئەڵێ بشکێم‌و نەزرنگێمەوە »[١٤٢] یا « گەورە ئاو ئەڕێژێ ، بچـــووك پێی هەڵئەخلیسکێ »[١٤٣] یائەڵێن : « لە هـــــەموو هـــــەورێك باران نابارێ »[١٤٤] . پەندی‌پێشینان باوەڕی قووڵی خەڵك بەوە دەرئەخـــا کە کاروانی ژیان بەرەو پێشەوە ئەڕوات ، بۆیە زۆر بە دڵنیایی ڕوویان کردۆتە کۆسپەکانی سەرەڕێ‌و ووتویانە « سەگەو بە مانگە شـــــەو ئەوەڕێ »[١٤٥] . هەروەها زۆربە ڕەنگینی‌و جوانی‌و لـــــە قالبێکی بەرزی هونەردا هیوایان بە دوارۆژ نیشان‌داوەو ووتویانە« کەڵەشێریش نەبێت خوا ڕۆژهەر ئەکاتەوە »[١٤٦] یا ووتویانە « لە پاش تەنگانـــە خۆشی‌یە »[١٤٧] یا « هەتا تاڵی نـــــەبینی خۆشیش نابینی »[١٤٨] . هەروەها ئەم پەندانە باوەڕێکی بەتین دەرئەبڕن بە جەوهەری ئینسان‌و بە توانای بەرەوپێش چوونی ــ بۆیە ووتراوە « ئینسان وەك گا[١٤٩] لە پێستێکا نابێ »[١٥٠] .هەروەها پەندی « هەر دەوەنە ئەبێ بە دار ، لە بنیا ئەحەسێتەوە فەقیرو هەژار »[١٥١] . پـــەندی‌پێشینان وەڵامی ئەوەشمان ئەداتەوە کە ژیان چۆن بەرەوپێش ئەچێت‌و ئەڵێت : « لافاو لە تکە پەیدا ئەبێ »[١٥٢] . ئەم پەندە بە تەواوی لە یەکی لـــــە یاساکانی فەلسەفەی تازە ئـــەچێت ــ ئەویش ئەوەیە کـــە هەموو کۆبوونەوەیەکی شت لە میقدار ــ کم ــ گۆڕینی جۆر (کیفیـــة)ی

له دوایه ٠

وه‌ك ووتمان ـ په‌ندی پێشینان ـ نموونه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی خه‌ڵکه ٠ وه گه‌ر ته‌ماشای هه‌ر کتێبێکی فه‌لسه‌فه بکه‌ین ئه‌بینین فه‌لسه‌فه به زانستێك دائه‌نرێ که هه‌موو ژیان ـ به سروشت و کۆمه‌ڵ و بیره‌وه بگرێته‌وه ٠ بۆیه ئه‌بینین که په‌ندی پێشینانیش هه‌موو کوڕێکی ته‌جروبه‌و ژیان ئه‌گرێته‌وه ٠ بۆ نموونه ـ له پاڵ ئه‌و هه‌موو مه‌به‌سانه‌دا که ده‌رمان‌خستن په‌ندی پێشینان چۆته ناو ژیانی ڕۆژانه‌ی خه‌ڵکه‌وه‌و ته‌جروبه‌ی ده‌رباره‌ی به‌جێ‌هێشتووه ٠

له کۆڕی پاراستنی ته‌ندروستید' ووتویانه : « که‌م بخۆ و مه‌چۆره سه‌ر حه‌کیم »[١٥٣] یا « خۆ ـ کا ـ هی خۆت نه‌بوو کایه‌نه‌که هی خۆت بوو »[١٥٤] ٠

هه‌ر له مه‌بدانه فراوانه‌که‌ی ووریایی‌و دنیادیده‌یی‌دایه که کورد ئه‌ڵێ: « که‌س به دۆی خۆی نالێ ترشه »[١٥٥] ٠ بێ‌گومان ئه‌مه وا ئه‌گه‌یێت که زه‌حمه‌ته پیاو دان به هه‌ڵه‌ی خۆیدا بنێت ٠ به‌ڵام ئه‌مه وا ناگه‌یێ که پێشینان ئه‌م ڕه‌وشته‌یان لاباش‌بووه ٠ چونکه ئه‌م په‌نده به ته‌وسه‌وه به یه‌کێك ئه‌ووترێ که بێ‌بناغه شانازی به شتێکی خۆیه‌وه‌بکات ٠ هه‌ر له‌م باسه‌دا ئه‌ڵێن « دۆم بێ‌و کلاش بۆ خۆی بکات »[١٥٦] ٠ ئه‌م په‌نده له‌و مانایه‌ی پێشووشدا‌و بۆ په‌سندکردنی کرداری باش‌و پسپوریش به‌کاردێت ٠ هه‌ر له شێوه‌ی ته‌وسدا پێشینان باسی, چه‌ند سروشتێکی تری ئاده‌میزادیان کردوه‌و ووتویانه : « له ئه‌سپی ( نه‌بوو ) ئاخوڕی بۆ هه‌ڵئه‌به‌ستێ »[١٥٧] یا ووتویانه « ڕێوی خۆی به کونه‌وه نه ئه‌چوو هه‌ژگێکی دوای خۆی خستبوو »[١٥٨] ٠ له کۆڕێکی‌تری ژیاندا ـ له باسی ڕووکه‌شی‌و خۆنواندنی بێ‌بناغه‌و بناواندا ووتویانه : « ناوی گه‌وره‌و دێی وێران »[١٥٩] یا ووتویانه : « ده‌نگی ده‌هۆڵ له دوور خۆشه »[١٦٠] ٠ له باسی ئیشی نابه‌جێ‌و ناوه‌خت‌و نه کولاوو سه‌ر که‌شی‌دا پێشینان ڕای

خۆیان له پەندێکی جواندا داڕشتوەو ئەنجامی ئەم جـــۆره کارەیان خستۆته ڕوو و ووتویانه : « کەڵەشێر له ناوەختا بخوێنێت ســــەری خۆیو ساحێبی ئەخوا » • هەر له بارەی کرداری نابەجێو پەشیمانی له دوادا ووتویانـــه « پەشیمانان شـــاخیان لێ ڕوایه ، شـــاخی لێدەرئەهات »[١٦١] واته ــ تا ئەمڕێ نیشانەی پەشیمانیی پێوه دیارە•

پەیڕەوی ژیانو قـــــەو باوی خەڵکی لـــەلای پێشینان زۆر دیاربووه • هەر وەك ووتویانه : «قسه هەزارەو دووانی بەکارە»[١٦٢]• هەروەها ئەوەشیانزانیوه که پەندو باو و قسه هەمووکات ( له کۆمەڵی ئێمەدا ) ڕاست نییه • به تایبەتی بۆ کەسێك که کەوتبێ پێشینان ئـــەم باسەیان خستۆته چوارچێوەی ئەم پەنده ڕەنگینەوه کـــــه ئەڵێ : « گلۆلەم کەوته لێژی ، کەس خاسم پێ نالێژی »[١٦٣] • یا هەر لـــــه باسی دنیادیدەییدا بڕوانینه ئەم پەندەش که ئەڵێ « سەگ به زەبری کلکی ئێسقان ئەشکێنێ[١٦٤] بەڕاستی ئەم پەنده له مەیدانی سیاسەتی ئەمڕۆدا بەسەر زۆر شتدا دێتەدی • هەر لەم بارەیەوه پـــــەندێکیش هەیه ئەڵێ : «کەچەڵ حەکیم بوایه ، دەرمانی سەری خۆی ئەکرد»[١٦٥]• وه هەر لەمەیدانی تەجروبەدا ووتراوه « قسه لەپاش جــــــەوت کێو ئەگاتەوه به خێو »[١٦٦] • یا له مەیدانی دڕۆو ڕاستی قسەدا ، لـــــه باسی به مەردانەو ئاشکرا قسەکردنو ئازایانه ڕا دەربڕینا ، به شێوەی تەوسەوه پێشینان ووتویانه : ( له پاش مردوو درۆ ئەکرێ )[١٦٧] •

هەر وەك ووتمان پەندی پێشینان له لایەکـــەوه بەری تەجروبەیەو له لایەکی ترەوه هەوڵی زانینی ژیانو ناسینی جیهانه ، واته بەشێکه له تیۆریی زانین لەلای ئادەمیزاد ، هەر بەم چاوه ئەتوانین بڕوانینه ئـــەو پەندەی ئەڵێ : « دز بازاڕی شێواوی ئەوێ »[١٦٨] گەر ئەم پەنده لـــه جوغزی خۆماڵیەوه بەرینه جــــــوغزی ژیانی ئابوریو سیاسیی جیهانەوه ئەو دەمه قووڵیی پەندەکەمان بۆ دەرئەکەوێ هــــــەر لەم بارەیەوه پەندێکیش هەیه ئەڵێ : « ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش »[١٦٩] •

ئەم پەندە هەر چەندە لە ئامۆژگاری‌یەکی سادە ئەچێت . لە کۆمەڵێکدا کە ژیانی ئادەمیزادی تیا مسۆگەر نەکراوە . بەڵام گەر لە جوغزێکی فراوانترا تەماشای بکەین دیسان قووڵی‌ی مەبەسمان بۆ دەرئەکەوێت .

هەر لە کۆڕی تەجروبەدا گەل شانازی بە ووریایی خۆیەوە ئەکات و ئەڵێ « خەڵکی کاغەزی سپی ئەخوێننەوە »[١٧٠] . واتە خەڵك زۆر سادە نین و بە هیچ شتێك هەڵناخەڵەتێن .

گەل هەمیشە بە چاوێکی ڕووناك ئەڕوانێتە ژیان و ئاسۆی دوور بە ڕۆشنی ئەبینێ و هیوای بە دواڕۆژە ، بروسکەی ئاوات لە پەندی پێشینانا هەمیشە ئەدرەوشێتەوە . کورد ئەڵێن : « کوێرە چیت ئەوێ ؟ دووچاوی ساغ »[١٧١] . دیارە ئەمە هەر بۆ کوێر نی‌یە ، ئاوات لە چوارچێوەیەکی تەنگتردا پیشان دراوە و ووتراوە « کوێر تا ئەمرێ بە تەمای چاوە »[١٧٢] . دیارە کوێر تا مردن لە چاو بێ‌بەری‌یە ، بەڵام ئەم پەندە قووڵی‌ی هیوا و هەمیشەیی پیشان ئەدا ، تەنانەت لە تاریکە شەوی نائومێدیدا . هەر لەم بابەدا ووتراوە : « تینو ئاو ئەبینێ لە خەوا »[١٧٣] . یا ووتویانە « خوا کڵاوی بۆ بەڕوو کردووە »[١٧٤] . بەڵام پێشینان ئەو تەجروبەیان پیشان داوین کە ئاوات بە قسە نایەتە دی بۆیە ووتویانە : « قسە فەقیرە هەموو کەس پێی ئەوێرێت »[١٧٥] . وە لە ناخی دنیادیدەیی‌یەوە گاڵتەیان بە هیوا و ئاواتێك کردوە ، کە بە قسە بۆی بچیت ، بۆیە ووتویانە « ئەگەریان دا بە مەگەر کوڕێکیان بوو ، ناویان نا کاشکی »[١٧٦] .



پەندی پێشینان وەك زانیمان خۆلاسەی دنیادیدەیی ساڵان و سەدەیانی ژیانی گەل و پیاوی ژیری نەتەوە ئەو تەجروبەیان کردووە بە سامانی ئامۆژگاری و بۆیان بەجێ‌هێشتووین . بەڵام ئایا ئەم گەلە یا نەتەوەیە هەمووی ، ژیانی لەسەر یەك هێڵ و بە یەك ئاراستەدا ڕۆیشتووە ؟

وەك ئەزانین « مێژووی هەموو کۆمەڵێك تا ئەمڕۆ ( یا ڕاستتر ئەوەیە بڵێین مێژووی تۆمارکراو • چونکە لە ساڵی ١٨٤٧دا مێژووی ئەو ڕژێمە کومەڵایەتی‌یانەی پێش تۆمارکردنی مێژوو کەوتوون ، کە بە دەوری پێش مێژوو ئەزانرێن ، لە نەزانراو ئەچوو ) ، هەر مێژووی کێشەی نێوان چینەکانە • کۆیلەدارو کۆیلە ، میرو گەدا ، ئاغاو جوتیار ، وەستاو شاگرد ، بە کورتی ، چەوسێنەرەوەکانو ئەوانەی ئەچەوسێنەوە ، هەرلە ناکۆکی‌دا بوونو جەنگێکی بەردەوام لە نێوانیانا هەر هەبوو ، ئیتر جاروبار ئاشکراو جاروبار شارراوە بووە ، جەنگێك کە ئەنجامەکەی یا گۆڕرانێکی شۆڕشگێرانە بووە کە هەموو کۆمەڵی گرتۆتەوە ، یا پێکەوە لەناوچوونی هەردوو ئەو چینە بووە کە لە کێشەدا بوون »(١٧٧) •

کەواتە نابێ لە پەندی پێشینانا وێنەی ئەو کێشەیە دیار نەبێو نابێ وێنەی بیرو ڕاو هوشیاری کۆمەڵایەتی‌ی دەستەی دووەمی ئەو کێشەیە دیار نەبێ •

ئەوەی تا ئێستا پیشانماندا پەندی زوربەی گەلە ، کە لە سەرتاپای فۆلکلۆردا ناومانا بەرەی خێرخوا • بەڵام لە پەندی کوردیدا وەك پەندی هەموو نەتەوەکانی‌تری جیهان ، پەندی ئەوتۆ هەیە کە بیرو جیهان‌بینینی دەستەکەی تری ئەو کێشەیە پیشان‌ئەدا ، کە بەشێکی کەمی نەتەوەیەو لە هەندی جێگەدا ناومان نا دەستەی ڕەنجخۆرو لە سەرتاپاکەی فۆلکلۆردا ناونرا بەرەی شەڕ ، یا بەدخوا • کە گیانو بیری تەواو پێچەوانەی ئەو گیانو بیرەیە کە لەمەوبەر دیسان •

لە یەکێ لەو پەندانەدا ئەڵێ « ئاگرە سووری ، لە خۆم دووری »(١٧٨) • ئەمە پەندی کەسێکە کە نەیەوێ لە کۆڕی بەرەوپێش‌چوونی ژیاندا ڕۆڵێکی هەبێو سەری خۆی داخاو نەیەوێ گڕی سووری قوربانی‌دانی ڕێگەی تێکۆشانی بەربکەوێ • پەندێکی‌تر لەم بارەیەوە ئەڵێ « دەست بە کڵاوی خۆتەوە بگرە با

ئەیـــات »[179] . یا ئەو جۆرە کــەسە تەواو ئەچنـــە جەرگەی خۆپەرستی‌یەوەو ئەڵێن «کە من نەمام لە پاش من دنیا وێران بێ»[180].

گەر پەندی دەستەی یەکەم‌و زوربەکەی گەل پڕبێ لە وێنــــەی ئازایی‌و لەخۆبوردن ، ئەوالە پەندی ئــەم دەستەیەی‌تردا ئــەڵێ : « دەستێك نەتوانم بی‌بڕم ، ماچی‌ئەکەم »[181] یا ئــەڵێ « کێ‌دایکمی هێنا پێ‌ی ئەڵێم مامە »[182] . یا ژیان ئەکەن بــە بازاڕێکی کڕین‌و فرۆشتن‌و قازانجی تاقە کەسی‌ی دوور لە دەروونی پاکی بــە نرخی ئادەمیزاد . بۆیە ئەڵێن « بۆیە پێت ئەڵێم مامە ؛ کــە چۆلەکەم بـۆ بگری »[183] یا ئەڵێ « تۆم‌کرد بە جۆلاّ مەکۆم بدزی »[184] .

لە زانستی تازەی ئیکۆنۆمی‌دا باسێکی درێژو قوول بۆ مەسەلەی « پارەپەرستی ــ واتە ــ صنمیة النقود » تەرخان‌ئەکرێ . کـــەوا ئادەمیزاد خۆی پارە دروست ئەکاو دوایی خۆی ئەبێ بە کۆیلە بۆ ئەو پارەیە . جا ئەم بیرە لە پەندی پێشینانی کوردیدا بە شێوەیەکی سادە ، بەلاّم زۆر بە ڕەنگینی خراوەتە ڕوو . پەندێك هەیە ئــەڵێ « دەستی تەمـــــاع درێژە »[185] یا ئەڵێن « پارە بدەیت مەلا لە مزگـــەوت دەرئەکەیت »[186] . یا ئەڵێ « پارەت بوو کــــەس ناپرسێ کوڕی کێ‌یت »[187] . هەر لەم بارەیەشەوە پاش گێڕانـــەوەی چیرۆکێکی درێژی گاڵتەوگەپی کوردی پەندێکی کورت هاتۆتەکایەوە کە ئەڵێ : « کەوا بخۆ » . یا چەند ناوی وەك « پارە پەرست » یا « پارەپیس » هاتۆتە فەرهەنگی زمانەوە .

لەم مانایەوە نزیك پەندێکی‌تریش هەیە ئەڵێ « نان ئەو نانەیە[188] ئەمرۆ لە خوانە »[189] .

لە کۆڕی نائومیدی‌یا ووتراوە « ساڵ بە ســـاڵ خۆزگەم بــە پار »[190] وە بەرامبەر بەو هەموو پــــەندەی ڕەنجدان‌و هــــەوڵ‌و کۆشش‌و پیاوی زەحمەتکێش بە بەرز ئەزانێ ، پەندی‌تر هەیە کــــە پێچەوانەی ئەوەیە ، وەك ئەڵێ « کیزێ هاتە ریزێ »[191] یا دەولەمەند

یە پیاوی هەژار ئەڵێ « بۆز بە لەڕی »[١٩٢] یا « کەری دێز حەز بـــە تۆپینی خۆیو[١٩٣] زەرەری ساحێبی ئەکا »[١٩٤] ٠ یا ئەڵێن «مەیموون جوان بوو[١٩٥] ئاولەشی دەردا »[١٩٦] ٠ ئەم پەندە لە کونجێکـــبەوە لەگەڵ ئەو پەندەدا یەك‌ئەگرێتەوە کـــە ئەڵێ « ماڵ خۆی لە خـــۆیدا نەبوو ، دزیش رووی تێ‌کرد »[١٩٧] ٠ هەر لەم باری سەرنجـــــەوە ووتراوە « خوا کێو نەبینێ بەفری تێ‌ناکا »[١٩٨] ٠ ئەم پەندە لــــــەو پەندەوە نزیکە کە ئەڵێ « حەیا تنۆکێکە کە تکا ، تکا »[١٩٩] ٠ هــەر لەم بارەیەوە ئەتوانین ئەم پەندەش بکەین بە نموونە کە ئەڵێ « ئاسنی سارد بە فوو نەرم‌نابێ »[٢٠٠] وە ئەتوانین لێرەدا چـــەند پەندێکی‌تر دووبارە بکـــەینەوە ، وەك ئـــەوەی ئەڵێ « چەپەرە شـــڕێ ، چ پێوەبدزێ ، چ لێوەبدرێ »[٢٠١] یا « بە حوشتریان ووت کوڕت بوو ، ووتی باری خۆم لەسەرپشتی خۆمە »[٢٠٢] ٠ وە لە کۆڕی خۆپەرستی « ئیگۆیزم »دا ئەتوانین ئەم پەندە بلێینەوە کە ئەڵێ « پیاو کـــەچووە شاری کوێران ، ئەبێ‌دەست بەچاوەوە بگری »[٢٠٣] ٠

---

(١) دەستنووس ٠
(٢) دەستنووس ٦
(٣) خاڵ ٠ ل ٤٨
(٤)(٥)(٦) دەستنووس ٦
(٧) خاڵ ٠ ل ١١٩
(٨) دەستنووس
(٩) قورئانی پیرۆز ، سورەتی یاسین ، ئایەتی ٨٢
(١٠)(١١) دەستنووس ١
(١٢) تەنی ووتری خوایەتی خۆی هەرلە کرد ٠ ( دەستنووس ١ ) ٠
(١٣) دەستنووس ١
(١٤)(١٥) دەستنووس ٦
(١٦)(١٧) خاڵ ٠ ل ٢٨
(١٨) خاڵ ٠ ل ٣٠
(١٩) خاڵ ٠ ل ٣٤

(٢٠) خال . ل ٥١

(٢١) خال . ل ٥٠

(٢٢) خال . ل ٤٨

(٢٣) خال . ل ٨٠

(٢٤) خال . ل ٨٥

(٢٥) خال . ل ١٢٣

(٢٦) خال . ل ١٣٩

(٢٧) خال . ل ١٤٥

(٢٨)(٢٩) دەستنووس .

(٣٠) خال . ل ٥٦

(٣١) خال . ل ٣٠

(٣٢) خال . ل ١٤٤

(٣٣) خال . ل ٨٥

(٣٤) خال . ل ٥٢

(٣٥) خال . ل ٢٥

(٣٦) خال . ل ٩١

(٣٧) خال . ل ٥٢

(٣٩) خال . ل ٥١

(٤٠) خال . ل ١٨٦

(٤١) خال . ل ٣٩

(٤٢) خال . ل ٣٢

(٤٣) خال . ل ١٠٦

(٤٤) خال . ل ٧٣ . ( ئەم پەندە باوەڕێکی قووڵیشی تیایە بەوەی کە پیاوی بلیچ هەمو دنیای هەبێو ئەوە بەهەشتییە ، ئیتر بەهەشتی‌تر نابینێ ) .

(٤٥) خال . ل ٥٨

(٤٦) خال . ل ٧٩

(٤٧) خال . ل ١٧١

(٤٨) دەستنووس

(٤٩) دەستنووس ١

(٥٠) خال . ل ١٧٣

(٥١) خال . ل ١٢٤

(٥٢) دەستنووس

(٥٣) دەستنووس ١

(٥٤) خال . ل ١٧٠

(٥٥) دەستنووس

(٥٦) خال . ل ٩٨

(٥٧) خال . ل ٢١

(٥٨) خال . ل ٤٩

(٥٩) خال . ل ١٠١

(٦٠) خال . ل ١٢٣

(٦١) خال . ل ٨٨

(٦٢) خال . ل ١٤٤

(٦٣) خاڵ . ل ٨٢
(٦٤) خاڵ . ل ٧٠
(٦٥) خاڵ . ل ٧١
(٦٦) خاڵ . ل ١٧
(٦٧) دەستنووس
(٦٨) خاڵ . ل ٥٨
(٦٩) خاڵ . ل ٨٢
(٧٠) خاڵ . ل ٧٣
(٧١) دەستنوس ١
(٧٢) خاڵ . ل ١٨٨
(٧٣) خاڵ . ل ٨٥
(٧٤) دەستنووس
(٧٥) دەستنووس ١
(٧٦) خاڵ . ل ٦٧
(٧٧) خاڵ . ل ٦٧
(٧٨) خاڵ . ل ٣٤
(٧٩) خاڵ . ل ٤٢
(٨٠) ئەم پەندە بەمجۆرەشهەیە : ئاوی بروا بۆ رۆخـــــانە ، خوێش بیخوا ، نەک بێگانە . ( خاڵ . ل ١٣ ) .

(٨١) خاڵ . ل ١٢
(٨٢) خاڵ . ل ١٢
(٨٣) خاڵ . ل ١٧
(٨٤) خاڵ . ل ٢٠
(٨٥) خاڵ . ل ٥٥
(٨٦) خاڵ . ل ٥٣
(٨٧) خاڵ . ل ٥٧
(٨٨) خاڵ . ل ٥٦
(٨٩) خاڵ . ل ٣٥
(٩٠) خاڵ . ل ٧٢
(٩١) دەستنووس
(٩٢) خاڵ . ل ٤٢
(٩٣) خاڵ . ل ٢١
(٩٤) خاڵ . ل ١٧
(٩٥) خاڵ . ل ٨٣
(٩٦) خاڵ . ل ١٥٢
(٩٧) خاڵ . ل ٩٦
(٩٨) خاڵ . ل ٢٤
(٩٩) دەستنووس ١
(١٠٠) خاڵ . ل ٨٥
(١٠١) خاڵ . ل ٩١
(١٠٢) خاڵ . ل ١٧١
(١٠٣) خاڵ . ل ١١٠
(١٠٤) دەستنووس .

(١٠٥) دەستنووس

(١٠٦) خال ، ل ١٠٦

(١٠٧) دەستنووس

(١٠٨) دەستنووس ١

(١٠٩) دەستنووس

(١١٠) خال ، ل ١١٠

(١١١) دەستنووس

(١١٢) دەستنووس

(١١٣) خال ، ل ١١١

(١١٤) خال ، ل ١٠٤

(١١٥) خال ، ل ١١٦

(١١٦) خال ، ل ١٨

(١١٧) ئەم پەندە بۆپیچەوانەی ئەم مەبەستە ش بەکاردێت .

(١١٨) دەستنووس

(١١٩) دەستنووس

(١٢٠) دەستنووس

(١٢١) دەستنووس ١

(١٢٢) دەستنووس

(١٢٣) خال ، ل ١٢٦

(١٢٤) دەستنووس

(١٢٥) دەستنووس

(١٢٦) دەستنووس

(١٢٧) یا ( پیت پێ ئەکەنێ )

(١٢٨) دەستنووس ١

(١٢٩) دەستنووس

(١٣٠) دەستنووس ١

(١٣١) هەر لەم بارەیەوە ئێیان گەیاندووین کە بە خەفەت بدین بە دۆست ، دوژمن بە خۆمان خۆش‌کەین . لە شێوەیەکی ئــەدەبی بەرزدا وتوویانە : « ئــەلێی ژاڵە بۆ وا تاڵی ؟ لەبەر برا مردن ، گوڵت بۆ وا جوانە ؟ لەبەر دۆستێ دوژمن .

(١٣٢) ئەم پەندانە لە مانادا لەو حەدیسەی پێغەمبەر ئەچن کە ئەفەرموێ « لا یلدغ المؤمن من جحر مرتین» واتە خاوەن باوەڕ دوو جار لە کونێکەوە پێوەی نادرێ .

(١٣٣) خال ، ل ٣٦

(١٣٤)،(١٣٥)،(١٣٦) دەستنووس

(١٣٧) لەم بارەیەوە لە عەرەبیدا وتراوە ( اعط القوس باریها ) « واتە ، کەوان بــدە دەست خاوەنی .

(١٣٨) خال ، ل ١٥٦

(١٣٩) دەستنووس

(١٤٠) خال ، ل ٦٧٣

(١٤١) خال ، ل ٥٦

(١٤٢)،(١٤٣) دەستنووس،

(١٤٤) خال ، ل ٦٢٠

(١٤٥) خال ، ل ٩٧

(١٤٦) خال ، ل ١١٨

(١٤٧) ئەم پەندە لە مانادا لە ئایەتی ( ان مع العسر یسرا ) ( سورەتی ـ الانشراح ـ ئایەتی ٧ ) ئەچێت . واتە لەگەڵ تەنگانەدا خۆشییە.

(١٤٨) خال ، ل ٦٦٧

(١٤٩) ئەشووتری : ئینسان گا نی‌یـــە تا ئەمری لە پێستیکا بێت ـدەستنووس ـ

(١٥٠) خال ، ل ٢٤

(١٥١) خال ، ل ١٧٠

(١٥٢) خال ، ل ١٢١

(١٥٣) خال ، ل ١١٩

(١٥٤)و(١٥٥) دەستنووس

(١٥٦) خال ، ل ٧٥

(١٥٧) خال ، ل ١٣٢

(١٥٨) خال ، ل ٨٥

(١٥٩) دەستنووس

(١٦٠) خال ، ل ٧٩

(١٦١) دەستنووس ١

(١٦٢) خال ، ل ١٠٧

(١٦٣) خال ، ل ١٢٥

(١٦٤) خال ، ل ٩٧

(١٦٥) دەستنووس ١

(١٦٦) خال ، ل ١٠٧

(١٦٧) خال ، ل ١٣٣

(١٦٨) خال ، ل ٧١

(١٦٩) خال ، ل ١٤٤

(١٧٠) خال ، ل ٦٦

(١٧١)و(١٧٢) خال ، ل ١١٤

(١٧٣) خال ، ل ٥٢

(١٧٤) خال ، ل ٦٢

(١٧٥) دەستنووس

(١٧٦) دەستنووس ١

(١٧٧) مارکس.ك. ئـەنگلز.ف. مانفێستی پارتی کۆمۆنیست ( ســـالی ١٨٤٨ ) ، چاپی مۆسکۆ ، ١٩٦٤ ، ل ٣٧

(١٧٨) خال ، ل ١٢

(١٧٩) خال ، ل ٧٧

(١٨٠) خال ، ل ١١٩

(١٨١) خال ، ل ٧٨

(١٨٢) دەستنووس ١

(١٨٣) خال ، ل ٣١

(١٨٤) خال ، ل ٥٠

(١٨٥) خال ، ل ٧٨

(١٨٦) خال ، ل ٤١

(١٨٧) دەستنووس ١

(١٨٨) گەلێك پەند هەیە بە دوو جـــۆر لێك‌ئەدرێتەوە ، بۆیە کە لێرەدا کردوومانـــە بە نموونە مانای وانی‌یە کە بە شـــێوەیەکی پێچەوانە لێك‌نادرێتەوە .

(١٨٩) خال ، ل ١٥٥

(١٩٠) خال ، ل ٩٠

(١٩١) دەستنووس

(١٩٢) خال ، ل ٢٩

(١٩٣) لـە هەندێ گێرانەوەدا ، ( زەرەر ) ئـــەبێ بە ( زیـــان ) یا بە ( مـــەرگ ) و ( ساحێب )یش ئەبێ بە خاوەن .

(١٩٤) دەستنووس

(١٩٥) يا ـ مەیموون خۆی زۆر جوان بوو ،ناولەشی دەردا .

(١٩٦) خال ، ل ١٥٢

(١٩٧) دەستنووس ١

(١٩٨) دەستنووس

(١٩٩) خال ، ل ٦٠

(٢٠٠) خال ، ل ١٠

(٢٠١) دەستنووس ١

(٢٠٢) خال ، ل ٣٢

(٢٠٣) دەستنووس ١

## گاڵتەوگەپ:

گاڵتەوگەپ یا قسەی‌خۆش ، لە جیهانی ئەدەبیاتناسی‌و فۆلکلۆرناسیدا جێگەیەکی گرنگی هەیەو زۆر لە زانایانی جیهان بە کۆکردنەوەو لێکۆلینەوەیانەوە خەریك‌بوون . گاڵتەوگەپ بەشێکی بە نرخی سامانی نەتەوەیی‌و ئەدەبی سەرزاری خەلکەو یەکێکە لەو جۆرە ئەدەبانەی کە شەقلی شوێن‌و کات‌و سەردەم‌و سەدەی خۆیی پێوەیەو ئەبێتە ئاوێنەی تایبەتی گەلێك لە ڕوداوەکانی کاتی خۆی .

قسەی خۆشی کوردی یاخود ئەوی هەموو نەتەوەکانی‌تر تا ئێستە وەك هەموو بەشێکی فۆلکلۆر دەماودەم‌و پشتاوپشت یەك بۆ یەکی گێڕاوەتەوە . بەو پێیە لە گێڕانەوەو زۆرمانەوەدا بە پێی کات‌و شوێن‌و دیالێکتی ئەو کەسەی ئەیگێڕێتەوە گۆڕینی بەسەردا هاتووە . قسەی‌خۆش لە ڕووی ژانری ئەدەبی‌یەوە ئەچێتە ڕیزی حیکایەتی کورتەوە . هەرچەندە بە هەموو بارێك قسەی خۆش هەر لە ڕیزی فۆلکلۆردایە نەك ئەدەبی نووسراو .

قسەی‌خۆش چیرۆکێکی کورتە بەلام بە جۆرێکی گاڵتەئامێز داڕێژراوەو گیانی پێکەنینی کراوە بە بەردا .

پێکەنین لە ئەدەب‌و لە ژیاندا جاری وا هەیە هۆیە جاری وا هەیە لە خۆیدا مەبەسە . ئەو پێکەنینەی هۆیە ، ئەوە لە کۆڕی ئەدەبیاتدا ئەبێتە ژانرێکی تایبەتی . ئەبێتە هۆی ڕەخنەگرتن لە هەموو دیمەنێکی ناهەموارو خوارو چەوت لە ژیاندا ئەبێتە هۆیەکی تیژی گەڕان‌و پشکنین لە هەمولا ، لە هەموو جێیەك ، لە هەموو کاتێکدا بە دوای کەم‌وکوڕی‌و باری تالەباڕداو لە شێوەی گاڵتەدا بەو دیمەنە پەردە لە ڕووی ئەو کەم‌وکوڕی‌یە لا ئەدرێ .

ئەو پێکەنینەی هۆیە ، لە خۆیدا هاوارو نرکەیەکی نارەزایی‌و پرۆتێستە بەرامبەر بە هەموو شتێك کە بە لای ئادەمیزادەوە چەوت‌و

ناڕێك بێت • ئیتر ئەو شتە یا کەسێکە یا کۆڕێکە یا دەورو زەمانێکە یا ڕژێم و دەستەیەکە • زۆرجار ئەم جۆرە پێکەنینە لە دەروونێکی زامدارو پڕ ئازارەوە دێتە دەرێ و ئەبێتە دەنگێکی سەرشۆڕ نەکردن بۆ باری چەوتی ژیان و بانگێکی هیواو سەرکەوتنەو شێوەیەکی گاڵتەکردن و بە سووکزانینی باری چەوتی ژیانە هەر لەم ڕێوەیە کە گەلێك لە مێژوونووسانی ئەدەب قسەی خۆشیان دابەش کردووە بەسەرخانەی قسەی خۆش و گاڵتەوگەپی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریشدا ، ئەمڕۆ لە ژیان و جیهانی گەلاندا ؛ بە تایبەتی لە وولاتانی ئەوروپادا گاڵتەوگەپی سیاسی ؛ لە مەیدانی ڕەخنەگرتنی سیاسی و دەربڕینی بیری خەڵکدا جێگەی خۆی هەیە • وە لە زۆر وولاتدا ڕابەرانی سیاسی و کاربەدەستانی گەورە خۆیان بە دوای ئەم جۆرە گاڵتەو گەپەدا ئەگەڕێن کە زۆرجار ئەبێتە ئاوێنەی ڕاستەقینەی ڕای خەڵك بە رامبەر بە خۆیان و کرداریان •

هەروەك فۆلکلۆر تێکڕا بە سەرەتای ئەدەبی نووسراو ئەزانرێ هەروەها ئەم بەشەشی سەرەتایەکە بۆ نووسینی ئەدەبی گاڵتەئامێز کە بە ( سەتیر )و ( یەموور ) ناوئەبرێ •

ئەو پێکەنینەش کە ( هۆ ) نییەو مەبەسە ئەویش جێگەیەکی تایبەتیی خۆی لە مەیدانی ژیان و ئەدەبدا هەیە • ئەو حیکایەتی گاڵتەو گەپەی جەوهەرو مەغزایەکی قووڵی کۆمەڵایەتیی نییەو ڕەگ و ڕیشەیەکی ئەوتۆی لەناو ژیانی کۆمەڵدا دانەکوتاوە ، ئەویش هەر ئەچێتە ڕیزی ئەدەبی ئامانجدارەوە چونکە پێکەنینێکیش کە لە خۆیدا مەبەس بێت ئەویش هەر ئامانج و مەبەسێکی لە ژیاندا هەیەو لە ئەنجامدا ئەبێتەوە هۆ نەك مەبەس •

ئەدیبێکی هاوعەسر ئەگێڕێتەوە کەوا سەردەمێکی ژیانی خۆی لەگەڵ دەستە ئەدیبێکدا بردەسەر وە ڕۆژی چەند سەعاتێکیان بە قسەی ئەوتۆ و باسی‌واوە ئەبردەسەر کە پێی پێکەنن و پێی

رابویرن • ئەو ئەدیبە ئەلێ : هەرچەندە ڕۆژی چەند ســـەعاتێك پڕ بەدڵ هێندە پێئەکەنین کە تەواو بپچڕێین ، بەڵام وا مانئەزانی کـــە کاتی خۆمان بە پڕوپۆوچو قسەی بێماناو بێئامانجەوە ئەبەینە ســەرو ( کاتی زێڕینمان ) لە دەست خۆمان ئەدەین • بەڵام ئێستا کـــە ئەوان دابڕاوم و دوور کەوتومەوەو هەندێکیان وان لە ژێر گڵدا ، ئێـــستا هەست ئەکەم کە ئەو کاتە زێڕینەمان بەفیڕۆ نەڕۆیشتبوو • ئێـــستا هەست ئەکەم کە پێکەنین شتێکی گرنگە لەو شتانەی کـــە پێویستی ئادەمیزادەو هیچ لە هەناسەدان و خواردن و خواردنەوەی جیا ناکەمەوە • ژیانی ئادەمیزاد بەبێ پێکەنین بە فیڕۆ ئـــەڕوات و ئارەزووی ڕەشبین ئاگرێنێتی بەسەرخۆیدا ئەداو وات لێئەکات کە ئاسۆی فراوانی ژیان نەبینێ •

کەوتە پێکەنینی دووەمیش ئامانجێکی بەرزی هەیەو یەکێکە لـــە پەیامەکانی ئەدەبیات بەجێئەهێنێ •

چیرۆکی گاڵتەو گەپ وەك بەشێك لە ئەدەبی فۆلکلۆر خزمـەتی خەڵك ئەکات ، چونکە ژیانی پڕ لە پێکەینن وێنەی ڕاستەقینـەی ژیانی بەختیارە لەووتەو بەرهەمی شاعیرانی جیهاندا زۆر جار پێکەنین ئەکرێ بە نیشانەی بەختیاری ، ژیانی پڕلەپێکەنین ئەکرێ بە ئامانجی کەسایێك کەهەوڵی شادی و بەختیاری یانە •

قارەمانی گاڵتەوگەپ : گاڵتەوگەپ هەمیشە لە شێوەی چیرۆکێکی کورتدا دائەڕێژرێ ، جا ئەو چیرۆکە ـ یا ـ حیکایەتە ـ یا بـــە ناوی کەسێکەوە ئەگێڕرێتەوە یا چەند قارەمانێکی ( ناسراو ) یا (نەناسراوی) هەیە ، ( قارەمانی گاڵتەوگەپ ) باسێکی فراوانە لە باسەکانی ئـەدەبی فۆلکلۆر ، چیرۆکی گاڵتەوگەپ لای کوردو هەموو گەلان شەرت نییە کە ( قارەمان )و ( کەسانی ) حیکایەتەکەی هەر ئادەمیزادبێت ، بـەڵکو هەر وەك ( حیکایەت ) زۆرجار لـــە زمان دڕندەو ماڵاتو ( فڕندە )وە ئەگێڕرێتەوە ، هەروەها لە حیکایەتی گاڵتەوگەپیشدا هەمیشە دڕندەو

بالندە ئەبێتە ( نیشانە ) بۆ شتێك لە ژیانی ئادەمیزادا •

بەکارهێنانی نیشانە ـ یارمز ـ لەگەڵ ئـەدەبی ( سیمڤالیزم ـ ڕەمزی)دا جیاوازە • چونکە بەکارهێنانی نیشانە ، مەبەسی ئەدەبەکەی ڕۆشن‌و دیارەو باس لە شتێکی ئەم ژیانەئەکات • بەڵام ئـــــەدەبی ( ڕەمزی ) شتێکی دوورە لە ژیانەوەو جۆرە ڕاکردنێکە لـــــە ژیان‌و تەم‌ومژو نارۆشنی داتێکە بە ئەدەب •

چیرۆکی گاڵتەو گەپی کوردی کە ( نیشانە )ی تیا بەکار هێنراوە • ئەم جۆرە چیرۆکە تەنیا قالبی ( پێکەنینە )کە لـــــە حیکایەتی‌تری جیائەکاتەوەو ئەیخاتە ڕیزی گاڵتەوگەپەوە •

بۆ نموونە ئەم حیکایەتە ئەخەینە بەرچاو کە لە ریزی ئـــــەو حیکایەتانەدایە کە پێکەنینی کردووە بە ( هۆ ) بۆ مەبەسێك :

ـ ئەڵێ کابرایەك گیسێـــــك‌و مەیمونێکی هەبوو لەگەڵیـــــان ڕائەبوارد • ڕۆژێك کابرا چووە دەرەوە جامە ماستێك لــــــە ماڵا دانرابوو،مەیموونەکەچوو ماستەکەی هێنا هەمووی خواردو دەم‌ولێوی خۆی پاك‌کردەوەو چوو گیسکەکەی هێنا تۆزێ ماستی لە دەم‌ولووتی ئەو هەڵسوو جامەکەشی بە خاڵیتی لەو ناوەدا فڕێداو خۆیشی چـۆو لەولاوە قیت‌وقنج لێ‌ی‌دانیشت : لای نیوەڕۆ کــــە کابرا هاتـــــەوە سەیری‌کرد جامە ماســـــت هیچی نەماوە ، سەیرێکی مـــــەیموون‌و گیسکەکەی‌کرد ، تەماشای‌کرد مەیموون لە گۆشەیەکـــەوە بۆ خۆی کزۆڵـــــەی کردووەو دانیشتوە ، گیسکـــــەکەش لەولاوە بـــــە دەم‌ولووتی‌ماستاوی‌یەوە هەڵقوون هەڵقونیەتی • دارێکی هـــەڵگرتو چووە وێزەی گیسکی بەسەزمان ، مەیموونەکەش لە ترسی ئەوە کـــە نەوەك کابرا دواجار بایداتەوە سەرئەو ، هەموو جـــــار دەستێکی بۆ دەم‌ولووتی گیسکەکە درێژئەکردو کابرای تێ‌ئەگەیان کە ماستەکە گیسکەکە خواردوویەتی ، ئەوەتە هەمووی بەدەم‌و لووتیـــەوەتی : بۆ خۆی خۆیشی وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوو »[1] •

ئەم حیکایەتە لەپاڵ‌ئەوەدا ( بیر )ێك‌و « مەغزاومانا »یـــــەکی

قووڵو مەبەستێکی تیاداهەیە ، بناغەکەی هەر لەسەر ڕەگی قسەی خۆش‌وپێکەنین دانرۆوە ( ڕایەڵ )ی چنین‌و دارشتنەکەی بە کارهێنانی ( نیشانە )یە لە ئەدەبا • ( نیشانە )کەش لێرەدا ( گێلك )و ( مەیموون )ە کە هەریە کە بریتین لە نیشانەی تیپ ـ یا جۆرە ـ کەسێك لە کۆمەڵدا ، کەسێکی خام‌و بەخۆ نەزان‌و کەسێکی زۆرزان‌و تاواندار کە دەستی چەوری خۆی بە سەری خەڵکی‌تردا ئەسوێ بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەم چیرۆکە هەر لە ڕیزی گاڵتەوگەپدایە • چیرۆکی « گاڵتەوگەپ » زۆرجار ـ وەك حیکایەتی‌تر ـ ئەبێتە هۆی داچەسپاندنی پەندێك لە پەندەکانی پێشینان ، واتە حیکایەتەکە لە ڕیزی چیرۆك‌و ( گاڵتەو گەپ )دا ئەمێنێتەوەو پەندەکە ئەچێتە ڕیزی پەندەوە •

بۆ نموونەی ئەو پەندانەی لە (گاڵتەوگەپ)و (قسەی‌خۆش)ەوە هەڵقووڵاون ئەم قسەیە ئەگێڕینەوە •

ئەڵێن جارێك دراوسێ‌یەکی ـ مەلای مەزبوورە ـ چوو بۆ لای مەلا تا کەرەکەی بداتێ باراشی پێ بباتەئاش • مەلا ووتی : باوەڕ بکە لە دوێنێ‌وە کەرەکەم ناردووە بۆ شار • کابرا خەریك‌بوو بە نائۆمێدی بگەڕێتەوە دواوە کەچی کەرەکە لە ( تەویلە )دا زەڕاندی • کابرا بە مەلای ووت : ئەی ئەوە نی‌یە کەرەکەت لە تەویلەدایە ؟

مەلاش ووتی : بە خوا زۆر سەیری بەزەڕەی کەر باوەڕ ئەکەی بە ڕیشی سپی من باوەڕ ناکەیت[٢] •

جا ئێستا لە ناو کورداندا پەندێك باوە کە ئەڵێ : بە زەڕەی کەرەکەی باوەڕە بە ڕیشی سپی مەلای باوەڕ نی‌یە • ئەم پەندە خۆی‌و حیکایەتەکەی لەناو کورددا ماون ، بەڵام لە ڕیزی پەندی پێشینانماندا چەند پەندمان هەیە کە لە شێوەی « گاڵتەپێ‌کردن »و ڕەخنەی بە پێکەنینەوە دارێژراون ، بەڵام ئێستا ئێمە حیکایەتەکانیان نازانین • گەر لەگەڵ پەندەکانا حیکایەتەکانیشیان بمانایە ، ئێستا ئەوانیش

ئەچوونە سەر سامانی بە نرخی گاڵتەوگەپو « قسەی خۆشمان » ـ
زۆرتری قسەی خۆش بە دەم یەکێکەوە ئەگێڕێتەوە ، جا یا
حیکایەتەکەش دەربارەی تاقە کەسێك یا چەند کەسێکە ، ئەو کەسە ،
یا ئەو کەسانە زۆرجار هەیە ناسراون لە ژیانی ئەمڕۆ یا دوێنێی
خەڵکدا ، یا لە مێژووی گەلێکدا یا کەسێ‌دان کە ناوو شوێنەواریان
نەماوە ، یا کەسی خەیاڵین • ئەوەش حیکایەتی لە دەمەوە ئەگێڕێتەوە
یا کەسێکی ڕاستەقینەیە یا کەسێکی خەیاڵی‌یە کە لە ئەدەب‌ناسیدا
پێی ئەوترێ « قارەمانی گاڵتەوگەپ » • قارەمانی گاڵتەو گەپ
لای هەموو گەلان کەسێکی ڕاستەقینەیە خۆی لە خۆی‌دا قسە
خۆش‌و نوکتەبێژو قۆشمەیە قسە ئەکات‌و ئەکەوێتە ناو خەڵکەوەو
بڵاوئەبێتەوە ، جا ئیتر ئەو خەڵکەش شتێکی ئەخەنە سەرو لێی
زیادئەکەن‌و قسەی تر بەدەم ئەو کەسە ( ڕاستەقینە )یەوە
هەڵئەبەستن‌و هەر کەسێکیش قسەیەکی خۆشی بۆ هات بۆ
( برەو ) یا بۆ زۆرتر خۆش کردنی قسەکە ئەیداتە پاڵ ئەو کەسە
ڕاستەقینە قسەخۆشە ، یا جاری وا هەیە گەر قسە خۆشەکە
سروشتێکی سیاسی‌ی هەبوو ، ئەوا ئەدرێتە پاڵ کەسێکی
قسەخۆش ، کە قسەی لێ‌ناگیرێ • زۆر جاریش « قارەمانی
گاڵتەوگەپ » کەسێکی خەیاڵی‌یە ، خەڵك‌دروستی‌ئەکەن ،
تاقسەی‌بدەنەپاڵ‌و بە ناوی ئەوەوە قسە بگێڕنەوەو ڕەخنە لە باری
ناهەموارو نارێکی ژیان بگرن • زۆرجار قارەمانی « گاڵتەوگەپ »
تەنیا هی ناوچەیەکە ، واتە لەناوچەیەکدا ناسراوو بەناوبانگە ، زۆر
جار لەناو نەتەوەیەکدا بەناوبانگە ، زۆر جاریش قارەمانێکی
« گاڵتەوگەپ » هێندە ناوبانگ پەیدائەکات کە قسەی لەناو چەند
نەتەوەیەکدا بڵاوبێتەوە ، یا چەند نەتەوەیەك « قارەمانێکی
گاڵتەوگەپ »یان بەو ناوەوە هەبێ ، یا بەشداربن لە قسەو گاڵتەوگەپی
تاقە قارەمانێکدا ، ئیتر ئەو قارەمانە ڕاستەقینە بێت یا خەیاڵی •

ئەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە قسەی خۆشی ئـــەم قارەمانی گاڵتەوگەپانە ، تەنیا لە چەند ساڵو دەورێکدا ناگێڕرێتەوە ، بـەڵکو پشتاوپشت ، چەند سەدەیەك ئەم قسانە هەر باوئەبن ، لەناو نەتەوەیەك یا چەند نەتەوەیەکدا لەبەر تیشکی ئەم فاکتانەدا ئەتوانین بڕوانینە ئەو گۆڕینەی بەسەر ئەم قسە خۆشانەدا دێن‌و بڕوانینە داڕشتنیان لە ڕووی ( زمان )ەوەو بڕوانینە مەسەلەی قارەمانی هاوبەشی لە نێوان چـەند نەتەوەیەکدا ، لە ئەدەبی فۆلکلۆری گەلاندا •

بۆ نموونە ــ لەناو گەلێك نەتەوەی ڕۆژهەڵاتدا ڕیزە قسەیەکی خۆش ئەدرێتە پاڵ تاقە یـــەك ( قارەمان ) ، قسەکان هـــەریەکن ، وەرگیرانی پڕ بە پڕی حیکایەتەکانن لە زمانی یەکێك لەو نەتەوانـــەوە بۆ زمانی ئەوی‌ترە • ئەم حیکـــایەتانە بەو ناوەوە گاڵتـــەوگەپی قارەمانێکی ( قۆشمە )ی ڕۆژهەڵاتە خراوەتە ســـــەر زۆر زمانی ئەوروپا •

جا ئەو قارەمانی ( گاڵتەوگـــەپ )ە ، لای‌کورد بــــە ( مەلای مەشهوور ــ یابەــ مەلای مەزبوورە ) ناو ئەبرێ لای عەرەب ئەبێتـــە « جحا » یاخود « جحای ڕۆمی » لــــەلای تورك‌و ئازربایجان‌و ئەو نەتەوانەی زمانە کەیان لە کۆمەڵە زمانە تورکی‌یەکاندایە بە « خواجـــە نەسرەدین »و « مەلا نەسرەدین »و « نەسرەدین ئەفەندی » ناو ئەبرێ، وە لە لای گەلی ( وێگوور ) کە لە چین ئەژین ئەبێتە نەســـــرەدین ( ئەفاتتی ) واتە ( ئەفەندی ) •

لە سەرەتای کتێبی « لەتیفەهای تاجیکی »دا کە کۆکردنـــەوەی قسەی خۆشی تاجیکی‌یەو لە ساڵی ١٩٥٨دا لە تاجیکستان چاپ‌کراوە ئەو « گاڵتەوگـــەپ » انە ئەکرێ بە تاجیکی ، بـــەڵام دەربارەی قارەمانەکەی ئەڵێ :

« بەشی زۆری گەلانی ڕۆژهەڵات ئەیدەنە پاڵ خۆیان‌و قسەی جیاجیا دەربارەی رەگەزو بنچینەو جێگەی هاتنە دنیاوەی هـــەیە -

دەربارەی مەلای مەزبوورەو (شەخسیەتی) گەلێك (ڕا)و لێکۆلینەوەی عیلمی هەیە ، وە لە جیهـــانی فۆلکلۆرناسی ئەمڕۆدا گـــەلێك بەرپەچدانەوە لەم بارەیەوە هەیە[٣] .

« گەردلێڤسکی » کە فۆلکلۆرناسێکی گەورەیە مەلا هـــــــەر بەو « خواجە نەسرەدینی تووسی »یە ئەزانێ کە لە سەدەی سیانزەیەمدا ژیاوەو زانایەکی گەورەی ریازیاتیش بووە »[٤] . بەلاّم دەستەیەك لە زاناکانی ئەکادیمیای زانستی ئازربایجـــان ، پاش ئەوەی لـــەناو ( ئازەری )یەکاندا قسە خۆشەکانی « مەلا »یان کۆکردۆتەوەو لـــە « شەخسیەتی » « مەلا » کۆلیونەتەوە » ، بەرپـــەچی قسەکـــەی گەردلێڤسکی ئەدەنەوەو بە هەلّەی ئەزانن و « مەلا » بـــە شەخسێکی خەیالّی دائەنێن[٥] .

کامیل گەیلانی لە گۆڤارێکی عـــــەرەبیدا ، ئەم قارەمـــانی گالتەوگەپە بە « دوجەین کوڕی سابیت »ی عەرەبی دائەنێ کەوا بـــە « جحا » ناوی دەرکردووە وە ئەلێ « قسە خۆشەکانی ئەم تێکـــەلّ بەقسەی خۆشی « ناسرەدین »ی « تورك » کراوە[٦] . جا ئەم قسانە هەرچۆنێك بن ، ئێمە « مەلا » بە قارەمانێکی گالتەوگەپ و قـــــەی خۆشی کوردی دائەنێین ، هەرچەندە هەندێ لە زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کە « مەلا » کەسێکی خەیالّییەو قسە خۆشەکانی بەرهەمی چـــەند سەدەیەکن ، بەلّگەی ئەم قسەیەش جۆرو بردنەوە ســــەرچاوەی مێژوویی قسە خۆشەکانییەتی . واتە لەوچەند سەدەیەدا ، لە ناو ئـــەو چەند نەتەوەیەی ڕۆژهەلاّتدا چ قسەیەکی خۆش کراوە دراوەتـــە پالّ « جحا ــ یا ــ مەلا نەسرەدین ــ یا ــ مەلای مەزبوورە » بـــەم جۆرە لەلای گـــەلانی ڕۆژهەلاّت سامـــانێکی گەورەی گالتـــەوگەپ کۆبۆتەوەو دراوەتە پالّ ئـــەو ( قارەمانە ) قۆشمەیە ، هەرچـــەندە قسـەکانی هەریەکە شەقلی مێژوویی کۆمەلاّیەتی و کەرەســــەو بابەتی دەورو زەمان و شوێنێکی جیاوازی پێوەیە . هەر لەبەر ئەمە نەتەوەی

کوردیش ئەتوانێ شەخسیەتی « مەلای مەزبووره » بـــە قارەمانێکی قسەی خۆش و فۆلکلۆری خۆی بزانێ . تا ئێستا سێ جار بە کوردی کۆمەڵە قسەی خۆشی « مەلا » بڵاوکراوەتەوە . بەکەم جار لـــــە ساڵی ۱۹۳۹دا لەلایەن محەمەد مستەفا کوردی یە وە چـــاپ کراوەو پێشەکی ی بۆ نووسراوە[7] ، دووەم جار خاوەنی چاپخانەی «تەرەقی» لە کەرکـــــووك چاپی کردوەو ئــــەم پێشەکی یەی پێشووی لـــە چاپ داوەتەوە[8] . سێ یەم جار ساڵی ۱۹٦۷ لە چاپخانـــــەی هەولێر گیوی موکریانی کۆمەڵێك قسەی خۆشی مەلای بە ناوی « مـــەلای بەناوبانگ ــ مەلای مەشهور ــ بۆ پێکــــــەنین »ەوە لە چاپ داوەو پێشەکی یەکی بۆ نووسیوە[9] .

محەمەد مـــستەفا کوردی « مەلا » بە کورد ئەزانێ ، واتە لـــــە ڕەگەزدا بە کوردی ئەزانێ بۆیە لە پێشەکی یەکەیدا ئەڵێ :

( مەلای بەناوبانگ ناوی نەسرەدین و لە کوردەکانی مازندەرانی بووە بەلاَن ، ورشەو گێچەڵی ڕۆژگاری چەپگەڕ ( چەپاڵەی )داوە ، تا گەیاندوویەتی یە شاری ( ئاق شەهر ) وهاوچاخی (سولتان ئۆرخان) بووەو تا سەردەمی سولتان ( یلـــــدرم بایەزید ) ژیاوە . هـــــەتاکوو سەرەتای سەدەی حەوتەمینی کۆچی مابوو ، گـــۆیا پیاوێکی زیرەك و زاناو خۆش وەلاَم بووە لە گەڵ زانایاندا بە زانایی وە لەگەڵ نـــەزاندا بە پێی سەلیقەو هۆشی ئەوان دواوە ، لە تەمەنی ( ٦۰ ) ساڵی لـــــە ٦۷۳ی کۆچی لە (ئاق شەهر )دا کۆچی دوایی کردووەو گۆرەکــــەی لەوێدا زیارەتگایەکی گەورەیە )[10] .

گیوی موکریانی ئەم پێشـــەکەیـــــەی جارێکی تر نووسیوەتەوەو لێ ی زیادکردووەو ڕای خۆی دەربڕیوەوە ووتویەتی :

بەلاَم لە چاپەکانی تری کوردی و بە تایبەتی هی بێگانااندا گەلێك بیر و ڕای لێك جیاواز لەم بارەیەوە دەربڕاوە ، هی وا هەیە لای وایـــە مەلا فارس بووەو گەلێکیشیان لەسەرئەوەن کە مەلا نەسرەدین لـــــە

ڕەچەڵەکدا تورکەو لە دێی ( سێوری حەسار ) لەدایك بووەو لە سالی ٦٨٣ی کۆچی لە شاری ( ئاق شەهر )دا کۆچی دوایی کردووەو لەناو بنەچەی خۆیدا بە هونەروەرو زانا ناوبانگی دەرخستوەو لە چاپەکانی میسریشدا بە عەرەبی دەزانن • پاشان موکریانی لە زمان خوالێخۆش بووان ئەمین فەیزی بەگەو حاجی مستەفا پاشای نەمرودو مەولانازادە رەفعەتو ئەدەهەم بەگی چەرکەسەوە چیرۆکێکی سەیر دەربارەی پەیدابوونی قسەکانی مەلا ئەگێڕێتەوە[11] •

بەداخەوە ئەوانەی بە کوردی قسەی مەلایان چاپکردوە بە تەواوی بۆ ئەوە نەچوون کە چۆن بیسەلمێنن کە « مەلا » کورد یا « قارەمانی » گاڵتەوگەپی کوردە •

خاوەنی ڕشتەی مرواری لە بەرگی یەکەمدا لە سەرەتاکەدا لەم بارەوە نووسیویە : « ئەبێ ئێمە ئەوە بزانین کە لە ناو کوردا مەلا دەستەیەکی دیاریو ئاشکرابون بەوەی خوێندەوارو زانیار هەر ئەوان بوون • لە هەموو وەختێکاو لە هەموو شوێنێکا بە پەنجە پەنجەیان بۆ ڕاکێشاون • ئەم دەستەیە لە ناو مەردوما تا ئەوپەڕی بەچاوی گەورەییو ڕێز لێگیراوییەوە تەماشاکرابوون • لە ئیشی بچووکو زلدا پرس بەوان کراوە • تەنانەت ناوی هیچ کۆمەڵێکی تر نەبوە بەرامبەری لەگەڵ ناوی ئەوان بکا • لەبەر ئەوە ناوی ئەمان لەسەرزمانی گەورەو بچووك بووە • فەرمانێ کە ئەمان دایێتیان گێڕانەوەی نەبووە ، جا بەم بۆنەیەوە هەر کارو فرمانێك بووبێ دراوەتە پاڵ ئەوانو وتوویانە ( مەلا وای ووتوە ) یا ( مەلا ووتی ) ووتنی ئەم ناوە لەسەرزمانی خەڵك هەمووی نیشانەی خۆشەویستیو گەورەیی ئەوان بووە • وەکو چۆن لە ماڵێکا خێزانو ماڵومناڵی ئەو ماڵە هەر کامێکیان هەستنو قسەیەك بکەن بۆ ئەوە کە ئیتر ئەو ئیشە کێشەی تێدانەبێ هەر ئەڵێن ( باوکم وای ووت ) یا ( باوکم ووتی ) •

دیاره ئەم ڕستە نیشانەو بەڵگەیە بۆ گەورەیی باوکەکە کە لەبەرچاوی خێزانەکەوە ، ووتنی ناوی مەلایش لەبەرچاوی تێکڕای مەردمەکەوە • ئەم سەمەرەیە بووە بۆیە لە زۆر شوێنی سەرگوزەشتەو قسەی کوردیدا ووشەی ( مەلا ) پاڵەوانی سەرگوزەشتەکەیە • ئەم ڕایە گەر بە نیسبەت هەموو ئەو قسانەشەوە نەیەتەدی کە ئەدرێتە پاڵ ( مەلا ) خۆ بۆ زۆر لەو قسانە ڕاستە ، بێ‌گومان زۆر جار بووە هەر ( مەلا )یەکی تر یا کەسێکی تر قسەیەکی خۆشی کردبێ هەر دراوەتە پاڵ « مەلای مەزبوورە »(١٣) •

گاڵتەوگەپ ، وەك هەموو بەشەکانی ئەدەبی فۆلکلۆرو وەك بەشێکی ئەدەب بە تێکڕایی جۆرە ( هوشیاری‌یەکی کۆمەڵایەتی‌یە ) کە لە شێوەیەکی تایەتی‌ی هونەردا دائەڕێژێ‌و ( زمان )و ( ووشە ) ئەبێتە کەرەسەی ئەو داڕشتنە • جا سەرچاوەی ئەو ( کەرەسە )یە واتە زمان‌و ووشەکان چی‌بن‌و مولکی کام نەتەوە بن ئەوە ئەبێتە ( هۆ )یەك کە ئەو بەرهەمە بدرێتە پاڵ ئەو نەتەوەیە • لەبەر ئەوەی قسەکانی « مەلا » بە کوردی ئەگێڕێتەوەو لەناو کورددا باون ، ئەوا ئەو قسانە مولکی نەتەوەی کوردن‌و خاوەن‌و قارەمانەکەشی قارەمانی گاڵتەوگەپی کوردە •

ڕەنگە بووترێ کەوا ئەو قارەمانە ـ واتە ـ مەلای مەشهوورو قسەکانی تەنیا لای کورد نین ، لە وەڵامی ئەمەشدا ئەڵێین ، گاڵتەوگەپیش وەك بەشەکانی تری فۆلکلۆر ، وەك زۆر داستانی دڵداری‌و مێژوویی ، وەك پەندی پێشینان ، زۆری بەچەند زمانێك هەن‌و باون‌و زۆر جاریش هەریەك پەند کتوومت وەرگێڕانی پەندی نەتەوەیەکی ترە •

لە کاتی خۆیدا ووتمان ـ کات‌و شوێن ـ واتە ، زروفی ـ لەیەکچوو ، پەندو بەرهەمی فۆلکلۆری‌ی لەیەکچوو لای گەلێك نەتەوە ئەهێنێتە ـ کایەوە • ئێستاش ئەڵێین کات‌وشوێنی لەیەکچوو ،

ڕوخساری لەیەکچووی بەرەوپێش چوونی مێژوویی ، قسەی خۆش و گاڵتەوگەپی لەیەکچوو ئەهێنێتە کایـــەوە • وەك بە پەندەکانمـــان ووت ــ پەندی ــ هاوبەشی چەند نەتەوەیەك هەروەها بەم قســـــە خۆشانەش ئەڵێین موڵکی هاوبەشی فۆلکلۆری چەند نەتەوەیەك •

کەواتە شەخسیەتی « مەلای مەشهوور » ڕاستەقینە بێـــت یا خەیاڵی لە ڕەچەڵەکدا لەهەر نەتەوەیەك بووبێت ، بەلای ئێمـــــەوە هەر کوردەو قارەمانی گاڵتەوگەپی کوردی‌یە • یا ئەوپەڕەکـــــەی ئەتوانین ــ بڵێین بەشی کوردیشی پێوەیە ؛ وە یا ئەو قسانەی کـــــە لەناو کورددا باون ، یا هەندێکیان بە زمانی‌تریش هەبن •• ئەوانـــە موڵکی سامانی نەتەوایەتی کوردن • لەسەر ئەم بناغەیە لـــە قووڵی و فەلسەفەی ئەو قسانە ئەکۆڵینەوە کە ئەدرێتە پاڵ « مەلا »و بـــە ناوی ئەوەوە ئەگێڕرێتەوە ، ئەو قسە خۆشانە ، لەلایەکەوە پێ‌کـــــەنینیان کردوە بە مەبەس و لە ڕێگەی پێکەنینەوە ئاسوودەیی و خۆشی ئەخەنە ژیانەوە لەلایەکی‌ترەوە ، پێکەنینیان‌کردوە بە ( هۆ ) بۆ گاڵتەپێ‌کردن و پێکەنین • بە هەموو ڕوخسارێکی ناشیرین و نارەوا و چەوتی ژیان • ئەو قسە خـــــۆشانەی لە زمان « مــــەلا »ەوە ئەگێڕرێتـــــەوە ، ڕەخنەگرتنێکی بە تەوسە لە ڕژێمی کۆمەڵایەتی لە کەموکوڕیی ئـــەو ڕژێمەو ژیانی کۆمەڵایەتی بە تێکرایی بەڵام قسەکانی « مەلا » لـــەو ڕژێمە کۆمەڵایەتی‌یە ناچێتە دەرەوە کە مەلاو قسەکانی تیـــایە ، یا بڵێین ڕەخنەیەکی نەرمی بەتەوسەوەیەو هەولدانێکـــــــە بۆ ئەوەی دەردی کۆمەڵایەتی و کەموکووڕی ژیان لە چوارچێوەی ئەو ڕژێمـــــە خۆیدا چارەسەر بکرێ ، ڕەخنەیە لە تەلارو بینای کۆمەڵایەتی و ناگاتە ســـەر ڕەگ‌وبناغە • جاروبار ڕەخنەکانی مەلا ڕێك‌وڕەوانیژی کۆمەڵایەتی و لووتکەی ڕژێمەکە ئەگرێتەوە،جاروبار ناچارە شێوەی نیشانە،یا ڕەمز بگرێتەبەر •

پەندێکی کۆنی کوردی هەیە ئەڵێ : خوا کێو نەبینێت بـــــەفری

تێی ناکات[۱۳] • جا ئەم پەندە بکە بە حیکایەتێکی کاریکاتۆر و تابلۆیەکی بۆ بکەو سەرەوخواری بکەرەوە ، ئەم حیکایەتەی مەلا ئەگرێتەوە کە هیوایەکی زۆرو ئاوات و داخوازی ئەوەی تیایە کە زۆردار هیچ کات دەسەڵاتی نەبێت • بەڵام ئەبینین خاوەن قسەی خۆش ڕێگەی تیشانە ئەگرێتەبەرو زۆردار کە بە لای خەڵکەوە ئەبێ لەشێکی زەبەللاحی هەبێ لە وێنەی زلترین حەیواندا کە لەبەر چاویا نەخشە ئەکێشرێ و ئەگێڕێنەوە ئەڵێن : دەستە مرۆڤێك لەبەر مەلا دەپاڕێنەوە کە لە سەرمینبەری مزگەوتی ئامۆژگاری‌یەکیان بکات • ئەویش چووەسەری و ڕووی تێ کردن ووتی : خەڵکینە سوپاس و ستایشی خوابکەن ، ووتیان بۆچی ؟ ووتی : چونکە باڵی نەداوە بە حوشتر ، گەر باڵی ببوایە بەسەربانەکاتانەوە ئەنیشتەوەو هەمووی بەسەرتاندا ئەرووخان و ماڵوێرانی ئەکردن[۱٤] •

ئەم هیوایەی مەلا کە ئاواتی ئەو خەڵکەیە کەوا قسەکەیان دروست کردوە یا ئەیگێڕنەوە یا ئەیبیستن ، ئەم هیوایەی کە زۆردار دەستی‌نەبێت و باڵی‌نەبێت ، تا خەڵکی ماڵوێران نەبن ، ئەم هیوایە ئەبێتە باوەڕێکی ئەوتۆ کە زۆردار کاتێك دێتەوە ریزی خەڵکی و ئەچێتەوە بۆخی جاران کە بە تەواوی سەروگوێ بکرێ ، لێرەشەندا لە تابلۆیەکی کاریکاتۆریدا ڕێگەی نیشانە ئەگرێتەوەبەر •

لێرەدا زۆردار ئەخرێتە شێوەی مەلێکی گەورەوە ، بەڵام باڵندەیەکی ناشیرین و ئێسك قورس ، کە وەختێك لە شت ئەچێت کە سەروگوێ بکری‌و بە تەواوی روخساری ناشیرین بێ ئەگێرنەوە ئەڵێن « ڕۆژێك مەلا حاجی لەقلەقێك ئەگرێ و ئەیهێنێتەوە ماڵی‌و تەماشای سەروسەکوتی ئەکاو ناشیرینی دێتەبەرچاو ئەڵێ لە ( مەل ) ناچێ • دوای کەمێ بیرکردنەوە ڕائەپەڕێ ، چەقۆیەکی زۆر تیژ دێنێ ، دەنووك و کلکی لە بنداو هەردوو لاقی لە ئەژنۆدا ئەبڕێتەوەو لەسەر کورسی‌یەك دائەنێ‌و لەبەردەمیا ڕائەوەستێ سەرنجی ئەداتێ‌و ئەڵێ :

ها ئێستا له ( مەڵ ) ئەچێت[١٥] .

چیرۆکەکانی مەلا هەمیشە لە ڕێگەی ( نیشانەوە ) ڕەخنە لە ناقۆڵایی کۆمەڵ ناگرن . بەڵکو زۆر جار ڕێکوڕەوان ڕەخنە دەرئەبڕن . یا شێوەی چەند کەسێکی کۆنی مێژووئەکەن بە نموونە ، بۆ ئەوەی لەو شێوەیەدا ڕەخنە لە ئەمڕۆو ناقۆڵایی بارو کەسانی ژیانی ئەمڕۆ بگرن .

بۆ ئەم مەبەسەش لە حیکایەتەکانی مەلا دا شەخسیەتی تایبەتی خۆی دروستکراوە .

هەندێك لەو ڕەخنانە گشتین‌و باسی کەسێك یا بەدخواهێکە کە مەلا پڕ بە دڵ گاڵتەی خۆی پێئەکات‌و لە ڕێگەی ئەو گاڵتەپێکردنەوە داخی دڵی خۆی پێئەڕێژێ‌و ڕەخنە لەخۆی‌و کرداری ئەگرێ زۆرجار ئەو « بەدخواهی »و بەدخواهانە تاوانبارن‌دێنە بەردەمی « مەلا »و حیکایەتیش « مەلا »ی کردوە بە « قازی »یەك کە بڕیاری پڕدادی خۆێ‌یان بەسەردائەدات .

ئەم حیکایەتانەی قازی‌یەتی‌ی مەلای مەزبووره لە زۆر سیماو ڕوخساریا لەو حیکایەتانە ئەچێت کە ئەدرێنە پاڵ « قەرەقۆش » ئەمیش هەر چەندە لە ئەنجاما بوو بە پیاوێکی خەیالی بەڵام لە ڕەگەزدا کەسێکی ڕاستەقینە بووە . ئەو بەهائەدین قەرەقۆشە بووە کە زۆر لە جێگەی خۆیدا بڕیاری سەیری بەسەر پیاوخراپاندا داوەو جەریمەی کردوون‌و پڕ بە پێستی خۆیان سزای داون . بەڵام چونکە سزادانەکەی شێوەیەکی سەیرو عەنتیکەی تیادابووە ، بۆیە زۆرداران‌و پیاوخراپان سوودیان لەو « ڕەگەز »ی سەیری‌یە دیوە تا خاوەنەکەی بەدناوکەن .

هەروەها ئەو حیکایەتانەش کە ئەدرێنە پاڵ « قازی »و فەرمانڕەوایەتی مەلا ، هەر لەو بابەتەن . لە حیکایەتی « مەلا »دا شەخسیەتی ڕاستەقینەی مێژووش بەکار ئەهێنرێ‌و ئەکرێ بە نیشانەو ڕەمزی زۆرداری‌و خەڵك چەوساندنەوە . ئەوەش شەخسیەتی

( تەیمووری لەنگ )ە ٠ وەك ئەزانین تەیمووری لەنگ لە نێوان ساڵانی ١٣٣٦و ١٤٠٥ی میلادیا ژیاوە[١٦] ٠ جا ئەو گاڵتەوگەپەی لە زمـــان مەلاوە ئەگێڕێتەوەو باسی تەیمووری لەنگ ئەکات ، یا ئەبێ بەرهەمی سەدەی چواردەیەم یا پاش ئەوە بێت ، یا تەنانـــــەت زۆرجار ناوی تەیمووری لەنگ هەر نیشانەیەو سوود لە بوونی مێژوویی ئەو بۆ ئەوە بتراوە ، کە بکرێتە دیمەنو پەردە بۆ هەموو پیاوێکی زۆردار ٠

هەر وەکو میللەت کە داهێنەری ئەو قسانەیە لەودیو پەردەی باسی تەیمووری لەنگەوە بڵێت : زۆرداری‌و خراپە لە هەموو شوێن‌و کات‌و سەدەو سەردەمێکدا هەریەکەو یەك ڕوخسارو ماناو جەوهەری هەیەو ئەنجامیش هەریەکە ٠ بۆیە قسەیەکیش کە ئەمڕۆ دروست بکرێت هەر ئەتوانرێ بدرێتە پاڵ تەیمووری‌لەنگ‌و بە زمان مەلاوە بگێڕرێتەوە ٠

بەڵگەشمان بۆ ئەم قسەیە ئەمەیە کە ئەو قسانەی باسی تەیمووری لەنگەو لە زمان مەلاوە ئەگێڕرێتەوە شـــێوەو ڕوخسارێکی گشتیان هەیەو دەربارەی هەموو کەسێکی لە وێنەی تەیمور ئەووترێ ٠ ئـــەو قسانە هیچ شکڵێکی مێژوویی شەخسی تەیمووری لـــەنگ خۆی‌و مێژووی سەردەمی ئەویان پێوە نی‌یە ٠ لەگەڵ ئەمانەشدا شـــەخسیەتی تەیمووری لەنگ لەم چیرۆکانەدا بە شـــێوەیەکی گاڵتـــەوتەوس‌و کاریکاتۆری پیشان‌ئەدرێت٠مەلاش لەکانی دڵەوە گاڵتە بەو شەخسیەتە ئەکات ٠ ئەگێڕنەوە ئەڵێن :

جارێك مەلای مەزبوورەو تەیمووری‌لەنگ لە حەمامدا یەکتر‌ئەبینن٠ پەشتەماڵەکەی تەیمووری‌لەنگ چەند ڕیز زێڕی لێ‌دراوە ، تەیموور لە مەلا ئەپرسێ : مەلا ــ من پیاوێکی‌چۆنم ٠

مەلا ئەڵێ : پادشام تۆ پیاوێکی زۆر باشی پێنج‌سەد لـــیرەی زێڕ ئەهێنیت ٠ تەیموور ئەڵێ : تەنیا پەشتەماڵەکەم بایی پێنج ســـــەد لیرەیە ٠ مەلا ئەڵێ : قوربان ئەوەشم حساب کردووە[١٧] ٠

گەر ئەم قسە خۆشە وا دەرخات کە بەلای گەلەوە پیاوی زۆردارو

خوێن ڕێژ هیچ ناهێنێت و بە تەواوی دواپردی لە نێوان خـــەڵکو زۆرداریدا نەهێشتبێت . ئەوا قسەکانی تری مەلا دەربارەی تەیمووری لەنگ ، هەر لە چوارچێوەی حوکمداری تەیمووردا ڕەخنە لە کردارو ڕژێمی ئەگرێ وە نارەزایی خەڵکی بەرامبەر بەوانە دەرئەبڕیو قســەو ڕەخنەی ئەخاتە شێوەی گاڵتەکردنەوە ئەگێڕنەوە ئەڵێن .

ڕۆژێك تەیموور لە مەلا نەسرەدین ئەپرسێو ئەڵێ : خەلیفــەکانی عەباسی هەر یەکەیان لە قەبێکیان بووە وەکو ( موفق باللـــه ومتوكل على الله ومعتصم بالله )وە ئێتر ئەگەر من یەکێك بوومایە لـــەوان ، لەوانە کامەیانم هەڵبژاردایە ؟ مەلا خێرا لە وەڵاما ئەڵێ ــ خاوەنشکۆ بێ گومان ناوئەنرای ( نعوذ بالله )[١٨] .

هەر لەسەر ئەم پەیڕەوی ڕەخنەگرتنی هێواشە لە تەیمووری لەنگ و ڕژێمی ئەگێڕنەوە ئەڵێن : ڕۆژێك مەلا قازێك لەناو ڕۆنا ســـــوور ئەکاتەوە ، ئەیەوێ بە دیاری بۆ تەیمووری لەنگی بەرێ ، لەڕێدا زۆر برسی ئەبێ لاقێکی قازەکە ئەخوا . کە ئەگاتە خزمەت شاو دیاری یەکەی پێشکەش ئەکا ، تەماشا ئەکا قازەکە لاقێکی نەماوە . ئەپرسێ ئەم قازە لاقێکی نی یە ؟ مەلاش ئەڵێ شاهم خەڵکی ووڵاتی ئێمە گشتی یـــەك لاقن . لە پاش چەند ڕۆژێك مەلا لەگەڵ شادا بۆ گەڕان بە قـــەراخ جۆگەلەیەکدا ئەڕۆن ئەبینێ چەند قازێك لەبەر خـــۆر لەسەریەك قاچ ڕاوەستاون . مەلاش ئەڵێ : شاهم تەماشا بفەرموون ئـــەم قازانەش گشتیان یەك لاقن . پاشا فەرمان ئەدا بە جارێك کشەیان لێ بکـــەن . قازەکان لە ناوا بە دوو لاق باڵیان فش کردو هەڵاتن . پادشا ووتی :. مەلا ئەوە نێ یە دوو لاقیان هەیە ؟ مەلاش گوتی ئەگەر بە دار کشـــه لە تۆش بکەن بە چوارپێ دەفڕی[١٩] .

لە مەلاو تەیمووری لەنگ گەلێك حیکایەت ئەگێڕنەوەو ئـــەتوانین لەسەر بناغەی ئەوانە گەلێك لێکۆڵینەوە بخەینە بەرچاو .

گەر شەخسیەتی تەیمووری لەنگ لە هەندێ حیکایەتدا دیمــــ ی

پیاوی زۆرداربێ ئەیینین لە هەندێ حیکایەتی‌تردا هەر ئەو شەخسیەتە ئەبێ بە کەسێکی ئاسایی‌وە ئەخرێتە چوارچێوەی گاڵتەو قسە خۆشە ئاساییەکانی مەلاوە . یاخود لە جیاتی ئەوەی بووترێ مەلا بە کابرایەکی ووت ، یا کەسێکی‌دی بۆ ئەوەی تاپۆیەکی ڕاستەقینە بدرێ بە حیکایەتەکە شەخسیەتێکی ڕاستەقینەی وەك تەیمووری‌لەنگ ئەخرێتە ناو چوارچێوەی حیکایەتەکەوە . یا ئەتوانین بڵێین ئەو حیکایەتانە بۆ ئەوەن کە قارەمانی گاڵتەوگەپەکە یا بڵێین مەلا وابخرێتە بەرچاو کە پیاوێکی قەلەندەرە ، واتە دەربەستی ژیان نییەو کۆ لە گەورە ناکاتەوەو جیاوازی لە نێوان گەورەو بچووکدا ناکات‌و ڕەخنە لە هەموو لا و لە نارێکی‌و چەوتی هەموو لایەك وەك یەك ئەگرێ جاروبار کە لەو حیکایەتانەدا شەخسیەتی تەیمووری‌لەنگ وەك کەسێکی ئاسایی پیشان‌ئەدرێت کە مەلای قەلەندەر گاڵتەی خۆیی پێ ئەکات ، لێرەدا ئەتوانین قووڵتر بڵێین مەلا یا دانەری حیکایەت پاشایان‌و گەورە کەسان لەو قاڵبەدا فێری نەفس بچووکی ئەکات . لەو حیکایەتانەیە کە ئەگێڕنەوەو ئەڵێن :

ڕۆژێك مەلا لەگەڵ تەیمووری‌لەنگ ئەچێت بۆ ڕاو ، بارگیرێکی پیرو شەلی بۆ ئەهێنن . لە ڕێگەدا دائەکاتە باران هەموو کەسێك بە غار خۆی ئەگەیێنێتە ماڵێ ، تەنها مەلا بەجێ ئەمێنێ . ئەویش جلەکانی دائەکەنێ‌و لە ژێر خۆیدا رایان‌ئەخات ، تا تەڕ نەبن . بە هەر جۆرێك‌بوو گەیشتەوە ماڵێ . بارگیرەکە ئەیباتە تەویلەو جلەکانی خۆشی لەبەر ئەکاتەوەو ئەچێتە لای شا . کە تەماشای ئەکەن هەموو لەشی ووشکە ، سەریان سووڕئەمێنێ . شا پرسی ها مەلا ئەیینم جلەکانت هەموو وشکن ، مەلا ووتی بۆچی تەڕ بیم ، من پێش ئێوە گەیشتمەوە ئەم بارگیرە وەکو باڵندە ئەفڕی .

لەپاش چەند ڕۆژێکی‌تر دووبارە چوونەوە ڕاو . ئەم جارە تەیموور سواری ولاغە پیرەکە بوو ، وا ڕێکەوت دیسان باران بە مس گرمەکی

دایدا ، هەرکە سە لە ترسی سەرماو تەڕوتووشی بەغار خۆیانە گەیاندەوە ئاوایی ، ئەم جارە تەیموور بەجێماو هەموو لەشی تەڕبوو ، تا نیوەڕۆ بە لەقەلەق و شڕی و چۆرەچۆڕی ئاوەوە گەیشتەوە ماڵەوەو زۆر توورە بوو و بە شوێن مەلایدا ناردو ووتی : کوڕە هەی بەدخوو تۆ بۆچی ئەو درۆیەت لەگەڵ کردم و تووشی ئەو هەموو ئازارو تەڕوتووشی یەت کردم .

مەلاش ووتی : پاشا ئەگەر تۆش وەك من تێ گەیشتنت هەبوایە ، وەك من جلەکانت ئەخستە ژێر خۆتەوەو تەڕ نەئەبووی[٣٠] .

هەر لە قاڵبی ئەم جۆرە حیکایەتە کورتانەی مەلادا کە تەیمووری لەنگی پێ کراوەتە کەسی دووەم و دوانەتێك لە نێوانیاندا دروست کراوە ، حیکایەتێکی تر ئەگێڕنەوە کە لەو دیو پەردەی حیکایەتەکەوە فەلسەفەیەکی قووڵی گەل ئەگێڕرێتەوە ئەو فەلسەفەیەی لە ئەفسانەو چیرۆك و پەندی پێشینان و بەشەکانی تری فۆلکلۆری کوردی یا دیسان فەلسەفەی گەل دەربارەی جەوهەری ژیان دووبارە ئەکرێتەوە . لە ژیان گەیشتنی خەڵك ئەخرێتەوە بەرچاو . ژیان ئەکرێتەوە بە کێشەیەك لە نێوان چاکەو خراپەداو ئەو کێشەیە ئەکرێت بە جەوهەرو هۆی ژیان و پەیدابوونی سروشت و کۆمەڵ و ژیان .

حیکایەتەکە ئەمەیە کە ئەگێڕنەوە ئەڵێن :

تەیمووری لەنگ لە مەلا ئەپرسێ ، تا کەی ئەم خەڵکە هەر ئەمێنێت و ئەمرێت ؟ مەلاش خێرا ئەڵێ تا بەهەشت و جەهەنەم پڕ ئەبن .

دیمەنی لە ژیان گەیشتن و فەلسەفەی گەل لە ژیاندا ، لە هەندێ شوێنی چیرۆکەکانی تری مەلاشدا دەرئەکەوێ .

گەر ژیان خۆی بریتی بێت لە بزوتنەوەی جووڵانەوەو ژیان هەمیشە لەبەرەوپێش چوون و پێشکەوتن دابێت و هۆی ئەمەش هەر ئەو بزوتنەوەیەبێت ، یا لە کونجی ئەو فەلسەفەیەوە بڕوانینە ئەم حیکایەتە کە قووڵی و وردبینی خەڵکمان بەرامبەر بە جەوهەری

پەیدابوونو بەرەوپێشچوونی ژیان پیشان ئەدات .

ئەگێڕنەوە ئەڵێن : لە مەلایان پرسی ئەم خەڵکە بۆچی هەموو ڕۆژێك بەشێك بۆ ژووروو بەشێك بۆ خواروو ، بەشێکی بۆ ڕۆژهەڵات بەشێکی بۆ ڕۆژئاوا ئەچن ؟ مەلاش ووتی : ئەگەر گشت خەڵك هەر بۆ لایەك بڕوات ، لەنگەری دنیا تێك ئەچێت[٢١] .

گەر لە قسەکانی مەلادا لە فەلسەفەی ژیان وردبینەوە یا دەربارەی هەڵسوکەوتو گوزەرانی ژیان لە باری سەرنجی قسەکان بگەڕێین یا دەربارەی هەموو ڕووداوێكو بارێكو دیمەنێکی ژیانو دەربارەی تێکرا پێوەندی ئادەمیزاد لەگەڵ یەکدا لە کۆڕی ژیاندا ، پێوەندی تاقەکەسو کۆمەڵ یا بە پێچەوانەوە پێوەندی نێوان دەستەکانی کۆمەڵ هەموو جۆرە پێوەندییەکی کۆمەڵایەتیو ئابووریو تەنانەت سیاسیی ناوخەڵك ، ئەبینین بە ووردیو بە شێوەی لە وردەشت دوان ، لە قسەکانی مەلادا فەلسەفەیەکی تەواو بوومان دەربارەی ژیان دێتە بەردەم . ئەو فەلسەفەیەش بە ( تانوپۆیەوە ) لە هەموو فەلسەفە قووڵەکەی بەشەکانی تری فۆلکلۆری کوردی جیا نییە . تەنانەت لە ڕێڕەوی مێژووی فەلسەفەدا لە زۆر دیمەنی بیری فەلسەفی جیهان ئەچێت ، بەڵام قاڵبی گشتیی ئەم فەلسەفەیە گاڵتەو پێکەنینو گاڵتەپێکردنو نەخشەی کاریکاتۆرییە . هەر لەم قاڵبەشدا جاروبار هەندێ قسە ئەبینین کە زۆر بە ئاسانی لە قاڵبێکی لەسەر خۆو قسەی دانەدانەدا وێنەیان لە کتێبە گەورەو زەردەکانی فەلسەفەی ئیسلامدا ئەبینین ، لە مێژووی فەلسەفەدا گەلێك بیری جیاجیا دەربارەی (پارە)و پێوەندیی ئادەمیزاد لەگەڵ پارەداو ڕۆڵی پارە لە ژیاندا ئەبینین ، جا گەر کۆمەڵە قسەیەکی فەیلەسووفان دەربارەی پارەو ئەنجامی پارە بخەینە بەرچاو ئەوسا گوێ لەم حیکایەتەی مەلا بگرین ، قووڵیی بیری فەلسەفیی حیکایەتەکانی مەلامان دەربارەی پارەو بەرهەمی مادی لە ژیاندا بۆ دەرئەکەوێت ، ئەگێڕنەوە ئەڵێن :

جارێك مەلا دابەستەیەكی داتابوو بۆ قاوەمە ، قوتابییــەكانی ویستیان بە فێڵ سەری ببڕنو بیخۆن • ووتیان : مامۆستا خــەبەر هاتووە كە دووسبەی دنیا ئاخر ئەبێت ، كەواتە تۆ دابەستەت بۆچی‌یە؟ سەری ببڕەو بێكە بە خێر با بە هەموومان بیخۆین • مــەلا ووتی زۆر باشە • سەری بڕیو بردیانە دەشتو لەوێ كردیان بە بریانیو خواردیان • دوای تێرخواردن خــۆیان ڕووت‌كردەوەو چوون بۆ یاری‌كردنو مەلایان بە دیار جلەكانیانــەوە دانا • تا هاتنەوە مەلا جلــەكانیانی كۆكردەوەو ئاگری تێبەردان ، تا هەموویان سووتان ، كــە فەقێ‌كان گەڕانەوەو جلەكانیان بە سووتاوی دێت بە سەری خۆیانداداو ووتیان : مامۆستا لە ڕێی خوادا بۆچی ئەم پەندەت پێدا‌ین ، مەلا هیچ خۆی نەشلەژاندو ووتی :

ئێوە بۆچی هێندە چاوچنۆكو چاو برسین • ئەی سبەینێ (قیامەت) نی‌یە ؟ ئیتر جلتان بۆچی‌یە[٣٢] • لە كۆتایی ئەم حیكایەتەشــدا ئەوی ئەیگێڕێتەوە ئەڵێت : مەلا بەو جۆرە هەقی خۆی لێســەندن[٣٣] • بێ‌ئەوەی بزانێت لەو دیو پەردەی حیكایەتەكەوە چ‌فەلسەفەیەكی قووڵ هەیە • ئەم جۆرە حیكایەتە بێجگە لە دەربڕینی جەوهەری فەلســەفەی چاكەوخراپە شتێكی تری تیایە كە بە تێكڕایی لەگــەڵ حیكایەتەكانی تری گاڵتەوگەپی كوردی كە پەردەیەكی ( ئاینی )یان پێوەیەو باس لە ڕوانینە بیروڕای ئاینی ئەكەن و هەڵوێستێك بەرامبەریان پیشان‌ئەدەن • ئەخرێنە خانەی باسی ئاینەوە لە گاڵتەوگەپو فۆلكلــۆری كوردیدا‌و ئەتوانرێ لێكۆڵینــەوەی تایبەتی‌ی لەسەر بنووســرێ • لە كۆڕی فەلسەفەدا گەلێك قسە دەربارەی گاڵتەوگەپی مەلا ئەكرێ • گەر لــە جیهانی فەلســەفەو ئەدەبا نرخو بایەخێكی بەرز بدرێت بە « ئادەمیزاد » بە خۆشەویستی‌ی یەكترو بە گیانی دۆستیو برایەتیو تەبایی • گــەر ئەم گیانە بەرزە كرابێ بە سروشتێكی بەرزی ئادەمیزاد • ئەو گیانــە بە بەرز گیرابێت لە پێوەندی نێوان دوو ئادەمیزادا ، لــە پێوەندی‌ی

تاقەکەس‌و کۆمەڵدا ، لە پێوەندی نێوان دوو گەلی دەستەبراو نێوان نەتەوەکانی سەرزەمیندا ، ئەبینین حیکایەتێك کە بە زمانی مەلاوە ئەگێڕرێتەوە سەرزەمین ئەکات بە نیشتمانی ئەو خەڵکەی لەسەر مەرزی ئەژین . گەر زەمین هەمووی لە یەك بچێت ، بۆچ ئەوی لەسەر زەمین ئەژین هاونیشتمانی‌و برای یەك نەبن . لە زمان مەلاوە ئەگێڕنەوە ئەڵێن .

ڕۆژێك مەلا چووە سەر مینبەر ڕووی کردە خەڵکی ووتی :

خەڵکینە بزانن هەوای ووڵاتی ئێوەش وەکو هەوای ووڵاتی ئێمە وایە . پرسی‌یان : بەچی‌دا ئەزانی مەلا ؟ ووتی : بەوەدا ئەیزانم کە هەر ئەستێرەیەکی لە ووڵاتی خۆماندا ئەمدی ، لە ووڵاتی ئێوەش‌دا ئەیبینم . جا ئەم جۆرە بیرە لەبەرهەمی زۆر لە فەیلەسووف‌و ئەدیبانی مەزنی جیهاندا ئەبینین . فەیلەسووفی ڕۆژهەڵات ـ سەعدی شیرازی ـ ئەفەرموێ :

بچیتە هەر شوێنێك ڕەنگی ئاسمان هەر شینە[٢٤] .

ڕەنگە هەیە شێخی سەعدی مەبەسی لە دەردو ئازارو مەینەتی بێت . ئادەمیزادی هەموو جیهان بە هاوبەش بزانیت لە دەردو تاڵی ژیاندا . بەڵام ئەم قسەیەی کورد لە زمانی مەلاوە ئەیگێڕێتەوە ، وەك دیمان ئادەمیزاد لە خۆشی‌و ناخۆشی‌و سەرەنجاما بە هاوبەشی یەکتر ئەزانێ گەر ئەستێرەی ئاسمان‌و ئاسمان خۆی‌و شەوو ڕۆژو هەموو سروشت بە لای مەلاوە بۆ هەموو خەڵکی زەمین بێت ، ئەبێ خۆشی‌و ناخۆشی‌ی ژێر ئەو ئاسمانە شینەش بۆ هەموان بێت جا لەم حیکایەتەدا دووبارەکردنەوەی قسە بە نرخەکانی ، فەیلەسووفە مەزنەکانی ڕۆژهەڵات‌و مرۆڤایەتی‌و پیاوانی مرۆڤ‌پەرستی هەموو سەدەو دەورێك ئەبینین‌و گیانی بەرزی پڕ خۆشەویستی‌و برایی ناخی دەروونی نەتەوەی کورد ئەبینین . ئەماتوانی گەلێك زۆرتر لای قسەکانی مەلا بوەستین لە ژێر هەر حیکایەتەدا لێ‌کۆڵینەوەو لێ‌دوانێك بنووسین‌و

بەهایەکی بەرزی ئەدەبیو فەلسەفیی بدەینێ ، بـەلام وا دیارە ئەوە بۆ ئاتێك نەبێت لە کۆمەلەیەکی تـــەواوی ئەو قسە بە نرخانـــە کۆبکرێتەوەو باسیش هەر بۆ ئەوەتە رخان کرێت •

## قارەمانی خۆماڵیی گاڵتەوگەپ :

لە مەیدانی قارەمانی مێژوویی گاڵتەوگەپی هاوبەشی نـەتەوەکانی ڕۆژهەلاتدا ، قارەمانێکیتری گاڵتەوەگەپ بەناوبانگە • کـــە لە ناو خەڵکی ڕۆژهەلاتدا بە ــ بـــەهلوول ــ ناوی دەرکردووە • لـــەو سـەرەتایەدا کە بۆ ئەو کۆمەلە چیرۆکەی مەلا نەسرەدین نووسراوە کـــە بەشی ڕۆژهەلات ناسیی ئـــەکادیمیای زانستیی ئازربایجـــان چاپیکردووە دەربارەی ــ بەهلوول ــ گەلێك قسەکراوە ، لـــەوێدا ئەلێ بەهلوولو قسەکانی لە وولاتی ئازربایجانو لە هەموو ڕۆژهەلاتدا ناسراوون ، خەلکی ئەو ناوچەیە ــ بەهلوول ــ بە عـــەرەب ئەزانن‌و لە ناو خەڵکدا وا ناوبانگی سەندووە کە برای خەلیفەی گـــەورەی عەباسی ــ هارونە رەشیدە[٢٥] • لە ناو کوردیشدا ( بـــەهلوول )و قسەکانی هەر بەناوبانگن ، کوردیش کە باسی بەهلوول ئەکـەن وای دائەنێن کە برایەکی شێتی هارونەرەشید بووە • لەلای هەندێك کەس بەهلوول ، شێوازێکی سەخسیەتی ڕاستەقینەی شـاعیری ناسراوی عەرەب ئەبونوئاسە ، یاخود زۆر لە قسە خۆشەکانی ئەبونوئاس • وا ئەگێڕنەوە کە قسەی بەهلوولبن، یا زۆر لەو حیکایەتانەی ئەبونوئاس‌و قسەوباسی لە کۆشـــکی خەلیفەدا ، لە لا پـــەڕەی کتێبی گەورەو زەردەوە هاتۆتە ناو خەلك‌و لێی گۆڕراوەو شتیخراوەتە ســـــەرو قارەمانێکی بۆ دروست کراوەو ناونراوە بەهلوول ، کورد ئەلێن :

قسە یا لە شێت بێ یا لە مناڵ • واتە شێت‌ومناڵ پێچ‌وپەناو شت شاردنەوە نازانن‌و ئەوەی لە دلیانا بێت بە زمان ئەیلێن • بۆیە ئـــەم

بەهلوولەی لەناو خەڵکدا بووە بە قارەمانێکی شێتی گاڵتەوگـــەپ ، قسەی حەق‌و ڕاستەقینەی بە زمانەوە ئەگێڕێتەوە ، قسەی حەقیش ــ وەك کورد ئەڵێن ــ زۆر جار ( ڕەقە ) وەك بەردێك وایە ئـــەدرێتە بەسەرو گوێلاکی پیاوخراپان‌و زۆرداراندا،وە وەك حیکایەتی کوردی‌و ڕۆژهەڵات جووتە شەخسیەتی مەلای مەزبوورەو تـەیمووری‌لەنگی کردبوو بە بەهانەی زۆر ڕەخنەوزۆر قسەی‌حەق،هەر ئەو حیکایەتانەش جووتە شەخسیەتی بەهلوول‌و هارونەڕەشید ئەکەن بە پەردەو بەهانەی گێڕانەوەو دروست‌کردنی قسەی حەقی‌تر ، بەلام وەك ووتمان مــەلا بە پیاوێکی ژیرو زانا دروست‌کراوە بەهلوولیش بە شێت‌و قســـە لە ڕوویەکی ئەوتۆ کە کۆ لە هیچ ولە کەس‌ناکاتەوە ،

بۆ ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە توزێك قووڵتر بخەینە بـــەرچاو ، بابچینەوە سەر پیشەکی‌یەکەی ئەکادیمیای زانستی ئازربایجـــان بۆ قسەکانی مەلا نەسرەدین لەو پێشەکی‌یەدا ئەڵێت :

قسەکانی مەلا نەسرەدین رەخنە گرتنێکی نەرمە لـــەرژێم‌و خوو رەوشت وعادەتی کۆمەڵایەتی ، بەڵام قسەکانی بـــەهلوول لە سنووری رەخنە ئەچنە دەرەوە بۆ چوارچێوەی راپەرین‌و شۆرش رووبـــەرووی هەمووشتێکی نارەواو کۆن لە کۆمەڵدا ، گەر قســـەکانی مـــەلا نەسرەدین کەم‌وکوری کۆمەڵ لە سنووری رژێمە کۆمەلایەتی‌یـــەکەی خۆیدا چارەسەر بکات ، ئەوا قســـەکانی بەهلوول ئەو رژێمــــە کۆمەلایەتی‌یە بە جارێك ئەخاتەلاوە ، ئەیەوێ کۆن لاببـــات و تازە بهێنێتەکایەوەو لە سنوورو چـــوارچێوەی رژێم‌و پـــەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی تازەدا ، ئەو ناهـــەمواری‌و ناکۆکی‌و نارێکی‌یانـــتـــە چارەسەربکات کەوان لەبەرچاو[٣٦] ،

بەداخەوە تا ئێستا لە ناو کورددا هەولی ئەوە نەدراوە کە قسەکانی بەهلوول کۆبکرێتەوەو لە دەمەوە بخرێتە سەر کاغەز ، هەر لەبـــەر ئەوەشە کە ناتوانین لێرەدا لێکۆڵینەوەیەکی گەورەو فراوانی ئـــەو

قسانەی بخەینە بەرچاو • لێرەداو لە باسی شەخسیەتی قارەمانی.
بەناوبانگی گاڵتەوگەپی ڕۆژهەڵات بەهلوولدا هەر ئەمەوێ ئەوە
بڵێم کە بەهلوولیش وەك مەلا نەسرەدین گەر شەخسیەتێکی ڕاستەقینە
بێت یا خەیالی ، یا بنەرەتێکی مێژوویی هەبێت و
گورینێکی شەخسیەتی ئەبونوئاس بێت • گەر لە رەگەزدا لە هەر
نەتەوەیەك بێت یا قسەکانی لە ناو هەر نەتەوەیەکی تردا بڵاوبن ، بەڵام
بەهلوول بۆ نەتەوەی کورد هەر قارەمانێکی گاڵتەوگەپی نەتەوەی
کوردە • بەڵگەشمان هەر ئەو بەڵگەیە یەکە بۆ شەخسیەتی مەلای
مەزبوورە هێنامانەوە • ئەویش ئەوەیە کە قسەکانی بەهلوول و
شەخسیەتی خۆی لەناو کورددا ناسراوە وە قسەکانی بە کوردی
ئەگێڕێتەوەو ئەچنە سەر سامانی نەتەوایەتی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردو
زۆر لە قسەکانیشی تەواو ئەوەیان پێوە دیارییە کە لە ناو کورددا
دروستکراوون شەقلی تایبەتیی کۆمەڵی کوردەوارییانە پێوەیە •
گەر شەخسیەتی بەهلوول قارەمانێکی هاوبەشی زۆر نەتەوەی
ڕۆژهەڵات بێت و لەو ناوەدا قارەمانێکی گاڵتەوگەپی کوردیش بێت
ئەوا کورد خۆی خاوەنی قارەمانێکی گاڵتەوگەپی نەتەوایەتی خۆیەتی
کە هەر لەو تیپە یا جۆرەی بەهلوولە ، واتە قسەو حیکایەتەکانی
ڕاپەرین و هاوارێکی پڕ لە داخ و کینەو ڕقە بەرامبەر بە نارەوایی و
ناخۆشی ژیان • پەیرەوێکی پیرۆزی موسلمانان ئەڵێ : ( ناقل الکفر
لیس بکافر )[٣٧] واتە ئەو کەسەی قسەی کافران ئەگێڕێتەوە ( بەوە )
نابێ بە کافر • بۆ ئەبینین کورد ناوی کفر ئەحمەدی لەو قارەمانی
گاڵتەوگەپی نەتەوایەتییەی خۆی ناوە •
قسەکانی کفرئەحمەد لە ناو خەڵکی سادەو خوێندەواری سەردەمی
رابرووددا وەك یەك گێڕراوەتەوە • بەڵکو بەشی زۆری قسەکانی
کفرئەحمەد لە ناو مزگەوت و مەلاو فەقێدا بڵاو بووە • پیاوانی دین و
زانا موسلمانەکانی کورد ئاسۆیێکی فراوانی بیر کردنەوەو جیهان

جینیان بووه ، بۆیه قسه‌کانی کفرئه‌حمه‌دیان بلاوکردۆته‌وه • هه‌روه‌ك له‌و قسانه‌دا ( سه‌رزاری )و روخساری ده‌ره‌وه‌یان نه‌دیبێ که ره‌نگه‌نه‌زان به ( ناره‌وای ) بداته قه‌له‌م • زانایانی موسلمانی کورد ، قوولی‌و جه‌وهه‌ری کۆمه‌لایه‌تی قسه‌کانی کفرئه‌حمه‌دیان لێك‌داوه‌ته‌وه •

گه‌ر قسه‌کانی « کفرئه‌حمه‌د » قسه‌ی قاره‌مانێکی راسته‌قینه بوایه‌و هه‌مووی پێکه‌وه کۆبکرایه‌وه‌و بدرایه‌ته پاڵ زانایه‌کی کوردی موسلمان • گومان له‌وه‌دا نه ئه‌بوو که ناوی ئه‌و قاره‌مانه‌ی ئێستا بۆته په‌رده‌ی گاڵته‌وگه‌پ ئه‌بووه ناوی متصوفێکی گه‌وره‌و قسه‌کانی ئه‌چوونه ریزی بیری فه‌لسه‌فی‌و تصوفی کورده‌وه • ره‌نگه قسه‌کانی کفرئه‌حمه‌د له روخساردا ساده بن‌و نه‌نووسینه‌وه‌و بلاوبوونه‌بونه‌وه‌یان به‌ناو خه‌لکدا‌و له‌لایه‌ن خه‌لکی ساده‌وه گێرانه‌وه‌یان دیمه‌نێکی ساده‌یان‌داوه به‌و قسانه ، به‌لام له جه‌وهه‌ر‌و مانای قوولدا ، زۆر له قسه‌ی حه‌لاج‌و فه‌یله‌سوفه متصوفه‌کانی‌تری موسولمان ئه‌چێت که به‌و رێگه‌و رێچکه‌یه‌دا رۆیشتوون •

دیسان به‌داخه‌وه قسه‌کانی کفرئه‌حمه‌دیش تا ئێستا نه‌چوونه‌ته سه‌رکاغه‌زو کۆنه‌کراونه‌ته‌وه له پاڵ ئه‌وه‌شدا ئاسۆته‌نگی بیرکردنه‌وه‌ی گه‌لێك ره‌خنه‌گر وامان لێ‌ئه‌کات که نه‌توانین لێ‌کۆڵینه‌وه‌یه‌کی فراوانی قسه‌کانی ئه‌ویش بخه‌ینه به‌رچاو •

له باسی بیری وردی فه‌لسه‌فه‌و تصوفدا ، گه‌ر بمانه‌وێت سه‌ره‌تایه‌ك بۆ ئه‌و بیره دابنێین له ناو کورددا • بێجگه له به‌رهه‌م‌و کتێبی زانا موسولمانه‌کانی کورد ، که زوربه‌یان به زمانی‌تری – نا – کوردی – نووسراون ، له‌ناو خه‌لکدا وێنه‌یه‌کی رۆشنی ئه‌و بیره ئه‌بینین • له باسی په‌نده‌ی‌پێشینانذا چه‌ند وێنه‌یه‌کی « بیری » فه‌لسه‌فی‌و « تصوف »ی کوردمان خسته روو ، لێره‌شدا شایانی باس‌کردنه که قسه‌کانی کفرئه‌حمه‌دو گه‌لێك چیرۆکی « بێ‌ناو »و قاره‌مان بخه‌ینه‌وه یاد • که خاوه‌نی رشته‌ی مرواری هه‌ندێکیانی کۆکردۆته‌وه •

ئەمو قسانەی بیری فەلسەفیو تصوفی کورد بە شێوەی گشتی. لە سنووری فەلسەفی ئیسلامیدایەو رەنگە هەر یەکەشی بچێتەوە سەر رێچکەی یەکی لە مەزهەبە ناسراوەکانی فەلسەفەی ئیسلام •

بیروڕای فەلسەفەو تصوفی ئیسلام لەلای کورد باسێکی گرنگو شایانی باسە • گەر سەرەتای ئەم بیرە لە فۆلکلۆری کوردا « لە ئەفسانەو حیکایەتو پەندیپێشینانو گاڵتەوگەپدا » ببینین • ئەوا « تەلاری » ئەم بیرە لە شیعری زۆر لە شاعیرو رۆشنبیرانی کورددا دیارە • هەرچەندە تا ئێستا لەناو کورددا بە دەگمەن کەسانی ئەوتۆ هەڵکەوتوون کەلەسەر فەلسەفەیان نووسیبێ ، بەڵام ئەوانەش بەداخەوە ــ چونکە لە سامانی نەتەوایەتی کورددابڕاون هیچلایەکیان بەلای بیری فەلسەفی فۆلکلۆری کوردو فەلسەفەی زانایانی وەك ــ مەلای جزیریو بابەتاهیری هەمەدانی وە ئەحمەدی خانیو مەولەوی وە مەحوی روشن بیرانی تری کوردەوە نەکردۆتەوە •

لەپاڵ ئەو قارەمانانەی گاڵتەوگەپدا کە باسمان کردن ، لە ناو کورددا گەلێك قارەمانی تری خۆماڵیی گاڵتەوگەپ هەن ، کە هەر یەکە لە مەیدانی بەرەو پێشچوونی ژیانی کۆمەلایەتیدا نوێنەری جۆرە « رووداو ــ واتە ــ ظاهرة » یەکی کۆمەڵایەتین • بۆ نموونەی ئەو جۆرە قارەمانانە ــ لە کتێبی ــ گاڵتەوگەپی ــ پیرەمێرددا و لە رشتەی مرواریدا لە قسەی ناوخەڵکدا شەخسیەتی « لالەسەرحەد » ئەبینین • کە بە شێوەیەکی تایبەتی ، لە مەیدانی حیکایەتی گاڵتەوگەپ گێڕانەوەدا « خەوەکەی لالەسەرحەد » بەناوبانگە • کە بە چەند جۆرێك ئەگێڕێتەوە لەو دوو کتێبەی ناوبراودا بە جۆرێك نووسراوەتەوە « لالەسەرحەد » نموونەی سەرخێلێکی عەشیرەتی کۆچەری « جاف »ە لە « کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەمدا •

ئەو قسانەی لە زمانی « لالەسەرحەد »ەوە[٢٨] ئەگێڕێتەوە یا

ئەدرێتە پاڵ کوردێکی کۆچەر یا لادێ‌یەکی ئەو سەر دەمە ، یا لە هەندێ حیکایەتدا باسی عەشیرەتی « هەمەوەند » ئەکات . هەموو ئەم حیکایەتانە دیمەنی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە ئەگێڕێتەوە .

خەوەکەی « لالەسەرحەد » وێنەیەکی رۆشنی خۆشەویستی‌ی تیرەو عەشیرەتە کە بەلای زۆر لەزانایانی کۆمەڵایەتی‌یەوە سەرەتای هەستی نەتەوایەتی‌و نیشتمانپەروەری‌یە .

« لالەسەرحەد » لەو خەوە ( سەیرە خۆشەدا دەشتی شارەزوورو بەهارەکەی ئەکات بە بەهەشت‌و لە ناو جافدا « رۆغزایی » وەلە عەشیرەتی کورددا « جاف »و لە نەتەوەکانی دەوروپشتدا کورد لە هەموان زیاتر لە « بینایی چاوان » نزیك ئەخاتەوەو بە « بەهەشتیان » دائەنێ ) .

قسەکانی « لالەسەرحەد »و ئەوانی‌تری لەو « تیپە » ، هەموویان لاپەرەیەکی تری مێژووی کۆمەڵایەتی تیرەکانی کورد ئەگێرنەوە .

لە زۆر حیکایەتدا باسی « جاف »و « هەمەوەند »و رێگەگری‌و کاروان رووت‌کردنەوە لە قالبێکی پێکەنیندا ئەکرێ . بەڵام گەر سەیری بکەیت هەر لەو باسانە ئەچێت کە لە یادداشتی ئەو گەشت کەرە کۆنە بێگانانەدا ئەیبینین کە هاتوونەتە ناو کوردەواری‌یەوە .

دەربارەی « ئایین »یش هەر لەم حیکایەتانەدا دوو روخساری نەتەوەی کورد . لەلایەکی ترەوە لەناو نەتەوەیەکی سادەی ، زوربە نەخوێندەوارا لەدین نەگەیشتن‌و لە بەندی پەیرەوەکانی ئەو دینە « نەگەیشتن » بە هۆی عەرەبی نەزانینەوە ، وە بە ساکاری‌و رووکەش دەستدانە بەجێ‌هێنانی پەیرەوەکانی ئایین . ئەم چیرۆکانە هەموو ، لە رووی مێژووەوە ، لەو سەدەو کات‌و شوێنەدا ، واقیورماوی‌و سەرسامی‌ی تیرەی کۆچەرو نەخوێندەوارە بەرامبەر بە دیمەن‌و داهێنراوو روخساری تازەی شارستانی‌و ئەو ژیانی کۆمەڵایەتی‌ی

تازەیە کە شارستانی‌یەتی ئەیهێنێتەکایەوە •

گەر ئەم حیکایەتانە لەلایەکەوە دیمەنی ئەو رووداوەی مێـژووی کۆمەڵایەتی بن • لەلایەکی‌ترەوە « قاقاپێکـــەنین »ی ناخی دەروونی شارستانی‌یەتین بە ژیانی « کۆچەری »و « نەزانی »و « نـەخۆشی »و بەهەموو دیمەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دواکەوتوو •

گەر کورد « لالەسەرحەد »ی « رۆغزایی » کردبێت بە دیمـــەنی ئەو رووداوە لە ئەدەبی گاڵتەوگەپی فۆلکلۆردا ، ئەبینین هـــەر لەو حیکایەتانەدا کە لەناو عەشیرەتی « جاف »دا هەیە بەتایبـــەتی ئـەو حیکایەتانەی لە رشتەی‌مرواری‌دا کۆکراونەتەوە ، شـــەخسیەتێکی راستەقینەی مێژوو ئەگرێت بە کۆڵەکەی ئەو حیکایەتانەو هـەر لەناو « جاف »دا ئەبێتە هۆو رابەری بەرەوشارستانێتی رۆیشتن ئـــەویش شەخسـیەتی ناوداری « مەحمود پاشا »ی گەورەیە •

ئەگەر « لالەسەرحەد » قارەمانێکی دێهاتی بێت ئەوا لە فۆلکلۆری کوردیدا وێنە قارەمانێکی شارستانێتیش هەیە ، کە لە بنـــــەرەتدا شەخسیەتێکی راستەقینەیەو لە سەدەی پێشوودا لە شاری «سلێمانی» ژیاوەو ئێستاش قسەی کۆن‌و تازەی بە زمانەوە ئەگێڕێتەوە ، ئەویش قارەمانی بەناوبانگی گاڵتەوگەپی کوردی « ئەحەی‌کڕنوو »ە[٢٩] •

قسەکانی « حاجی‌ئەحمەدی کوڕنوو » بەرهەمی ژیانی شارستان‌و سەرەتای پەیدابوونی ژیانی تازەی شـــارستانێتی‌یە لە ناوچـــەی «بابان»دا • ئەم قسانەش نرکەی پڕ لە پێکەنینە، بە ژیانی دواکەوتووی دێهاتێك کە لە کۆشی « نەزانی »و « هەژاری »و « نـــەخۆشی »و ناهوشیاریدا « واژەی » دێ • لە پاڵ ئەمەشدا ئەو قسانەو هـــەموو ئەوانەی لە « تیپی ـ یاجۆر »ی ئەون رەخنەیەکی نەرمە لەو دیمـەن‌و بارە ناشیرینانەی لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌ی شارستاندا ئەبینرێ •

لە بارەی رەخنەو ـ پێ ـ پێکەنین‌و ـ گاڵتەپێ‌کردنەوە ، ئـــەم چیرۆکانە هەموو مەیدانێکی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و رۆژانە ئەگرنـەوەو

باس له هەموو جۆره پێوەندی‌یەکی کۆمەلایەتی ئەکەن‌و چـــەوتی گەلێك روخساری ئەم پێوەندی‌یانه دەرئەخەن • پێوەنـــدی نێوان « ژن‌ومێرد » • « بووك‌وخەسوو »و جۆری ژن‌هێنان‌و شـــووکردن ، باسی گوزەرانی خەلکی ، کاروکاسبی‌و مامەلەی رۆژانه ، « سوو »و « سەلەم »و « بازرگانی » ، پەنابردنه بەر نووشتەنووسین‌و بەر جادوو بۆ « گرێ » کردنەوەی ، سەختی ژیان‌و تەنگ‌و چەلەمەی ژیان‌و باری کۆمەلایەتی • ئەمانەو گالتـــەپێ‌کردنیان کەرەسەی ئـــەو جۆره چیرۆکانەن‌و گەر رەخنەلێ‌گرتنێکی چـــەوتی ، لەم پەیوەندیانـــەدا نەرمیش بێت‌و شتێکی وای تیادەر• کەوێت که « خەلك یا گەل » کـــه خۆی داهێنەرو بلاوکەرەوەی قسەکانه ، نیازی سەرتاپا گۆڕینی باری کۆمەلایەتی هەبێت • گەر ئەمەش دیار نەبێت ، خۆ قسەکان لـــه خۆیاندا بەلگەی نارەزایین له « چەوتی »و « دواکەوتن »و ســـەرەتای هوشیار بوونەوەو له « خەوهەلسان »و راپەڕین‌و وێنەی دەســـــت دانه گۆڕینی باری کۆمەلایەتین ئەم « رووداوه » کۆمەلایەتی‌یه ــ لـــه جەوهەردا ، له هەموو شوێن‌و کات‌و سەدەیەکدا هەریەکەو هـــــەر ئەمێنێ ، بەلام « وردەشت » واته « تفصیلات »ی به پێی شـــوێن‌و کات‌و زەمان ئەگۆڕێت‌و له هەموو بەرگێکیشدا هەر بەلگـــــەی بەرەوپێش چوونی کۆمەلە •

قارەمانی گالتەوگەپ ، له گەل رۆژدا ئەگۆڕێت وەهـــەر دەورو زەمانێك جۆره قارەمانێك‌و جۆره قسەو حیکایەتێك دێنێته کایـــەوه • بۆیه ئەبینین له پاش جەنگی یەکەمی جیهانەوه چـــەند قارەمانێکی تری گالتەوگەپ هەن ، که حیکایەتەکانیان وێنەی گالته کردنن بـــه ژیانی دەرەبەگایەتی‌ی دەوروبەری عوسمانی‌یەکان‌و گێڕانەوەی حیکایـــەت دەربارەی ئەو دەرەبەگه نەخوێندەوارانەی له پاش ئەو جەنگـــه پایەی بلندی فەرمان بەریان دراوەتێ ، له جەوهەردا رەخنەو گالته پێ‌کردن‌و پێ‌کەنینی نارەزایی دەستەی رۆشن بیریانه ئیستلاحی ئـــەو دەوره ،

پێکەنینی « منوەر »ە کانە بە « بەرەی » کۆنی فەرمانڕەواو بە ڕژێمی کۆنی کۆمەڵایەتی •

لەم مەیدانەدا ئەتوانین گەلێك ناوبکەین بە نموونە ، دەربارەی ئەوساو ئەمرۆش کە قارەمانی زیندوی گاڵتەو گەپمان هەیە ، لە بەرچاوی خۆمان خۆیان لە باسی کۆمەڵدا دوو قسەی خۆش ئەکەن لە ناو خەڵکدا « دە »یان بە زمانەوە ئەگێڕێتەوە • بەو جۆرە ئەو قارەمانی قسە خۆشانەی ئەمرۆ لە ناوماندا ئەژین سبەینێ لە ناو لاپەڕەی مێژووی ئەدەبی فۆلکلۆردا ئەبن بە قارەمانی خەیاڵیی مێژوو گەلێك قسەی ڕۆژانی داهاتووش بە زمان ئەوانەوە ئەگێڕێتەوە •

گەر ئەمرۆ لە ژیانی ڕۆژانەماندا تەماشایەکی ئەو پیاوە قسە خۆشانە بکەین کە لەناوماندا ئەژین ، زۆر باش بۆمان دەرئەکەوێت کە قارەمانی گاڵتەوگەپ چۆن لە دایك ئەبێت و دروست ئەکرێت و چۆن پەروەردە ئەکرێت و گەورە ئەبێت و ئەچێتە سەر لاپەڕەی مێژووی ئەدەبی فۆلکلۆر •

ئێستا لە ژیانی ئەمرۆماندا لە هەر ناوچەیە ، یا شارە ، یا گوندە ، کەسێ یان چەند کەسێکی قسەخۆش هەن ، کە ئەمانە یا یەکێکیان بەرەبەرە ، لەگەڵ ئەو پەرەسەندنەدا کە باسمان کرد ئەبێتە قارەمانی گاڵتەوگەپی هەموو نەتەوەو دوور نی‌یە ببێتە قارەمانی چەند نەتەوەیەك یا هەندێ لە قسەکانی بە زمانێکی‌تر بدرێتە پاڵ قارەمانی ئەو گەلەی‌تر •

بەم جۆرە ئەمرۆ لە ژیانی کوردەواریدا لە هەر ناوچەو شارە ئەتوانین ناوی چەند کەسێکی « قۆشمە »و قسە خۆش ببیستین ، بەڵام مێژوو ناوی کامیان ئەهێڵێتەوەو قسەکانی سەدەو سەر دەم ئەداتە پاڵ کامیان • ئەوە شتێکە مێژوو دوا ڕۆژ بڕیاری ئەدات و چەرخی بەرەوپێش چوونی دەوران هەمیشە شتی تازەو سەیریش

ئەهێنێتە کایەوە • بۆیە لێرەدا باس لەو قسەخۆشانە ناکەین کەوا دەورانی ئەمڕۆ تائێستا کردوونی بە موڵکی تاقە کەس‌و لەوانەیە دوا ڕۆژ زۆریان بەناوی یەکێکەوە لە مانەیا بەناوی کەسێکی ترەوە تۆمار کات‌و ڕەخنەگرانی ئەدەب‌و نووسەرانی مێژووی فۆلکلۆریش بیاندەنە پاڵ میللەت‌و بیانکەن بە کەرەسەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی•

## ئەدەبی نووسراوی گاڵتەوگەپی کوردی

تا ئێستا لە کوردیدا لەم بارەیەوە تەنیا ئەو « سێ‌جار » نووسینەوەیەی قسەکانی مەلای‌مەزبوورەمان هەیەو ئەسەرە گەورە بەنرخەکەی زانا عەلائەدین‌سوجادی ڕشتەی مرواری‌یە کە لە نامەخانەی ئەدەبی کوردیدا جێگەیەکی تایبەتی‌و دیاری بۆ خۆی گرتووەو تا ئێستا سێ‌بەرگی‌و هەر بەرگە لە ۲۰۰ لاپەڕەدا لە سالانی ۱۹۵۷و۱۹۵۸دا ڕۆشنایی دیوەو هیواداریں خوێندەواری کورد لە بەری بەرگەکانی تریشی بێ‌بەری نەبێت •

ڕشتەی مرواری لە کۆڕی ئەدەبی کوردی‌و ڕەخنەی ئەدەبی‌و لە مەیدانی باسی گاڵتەوگەپی فۆلکلۆردا باسێکی ووردو لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی‌ی ئەوێت •

پیرەمێردیش وەك ڕۆشن بیرێکی گەورەی کورد کە ئەرکی خۆی لە زۆر مەیدانی ئەدەب‌و ڕۆشن بیریدا بەرامبەر بە نەتەوەکەی بەجێ هێناوە • لەم مەیدانەشدا قسووری نەکردوەو هاتووە کۆمەڵێك لە گاڵتەوگەپی فۆلکلۆری کوردی‌ی کۆکردۆتەوەو بە ناوی « گاڵتەوگەپ »ەوە لە چاپی‌داوە •

خاوەنی ڕشتەی مرواری جارێکی‌تر هەموو ناوەڕۆکەکانی « گاڵتەوگەپ »ی‌پیرەمێردی چاپ کردۆتەوەو ئەو « ئەسەرەی » پیرەمێردی نەمری لە دەردی « کەم‌ژمارەیی »و « چاپ‌خراپی »و نەمان‌و دەست نەکەوتن ڕزگار کردووە •

ڕشتەی مرواری هەر کتێبی گاڵتەوگەپ‌و فۆلکلۆر کۆکردنەوە

نی‌یە ، بەڵکو وەك بەشی زۆری بەرهەمە بە نرخەکانی عەلائەدین سوجادی ، سروشتێکی ئەنسکلۆپیدی یانەی وای هەیە کە لە گەڵ پلەی رۆشن‌بیری‌و چاپەمەنی‌ی کوردیدا ئەگونجێن •

هەروەك زانا باش لە شوێن‌وکاتی چاپەمەنی‌ی کوردی گەیشتبێ‌و بیەوێ هەر کە کۆمەڵە بەرهەمێکی نووسینی تەواو بوو هەلی چاپی بۆ هاتە پێشەوە رێگەی خۆی بگرێ بەرەو چاپخانە ، بێ‌ئەوەی چاوەڕێ بێت کە هەر جۆرەباسە لە سیپارەیەکی جیاداو لە ژێر ناوێکــدا چاپ بکات‌و هەریەکەی بەرێتەوە سەر یەکێك لە سەرچــاوەکانی زانستی ئەدەب‌و زانست بە گشتی •

بۆیە لە رشتەی مرواری‌دا ، کۆمەڵێك لە بەشــەکانی فۆلکلۆر ئەبینین رستە چیرۆکێك کۆکراونەتەوەو نووسراو نەتەوە کە ئەچنەریزی ئەفسانەی کوردی‌یەوە ، چونکە کەرەسەکانی ئەو چیرۆکانە هەر لــەو کەرەسانەی ئەفسانەی کوردین کە لە مەوبەر باسمان کردن •

هەندێ چیرۆکی تر کۆ کراوەتەوەو نووسراوەتەوە ، کە ئەچنــە ریزی حیکایەتی کوردی‌یەوە ، ئەویش هەر لە بەر ئەوەی کەرەسەکەی لە کەرەسەی حیکایەت‌و بە کورتی قارەمانەکەی لە باتی «دێوودرنج»و هەندێ « پەلەوەڕ » ئادەمیزادەو حیکایەتەکان چیرۆکی کێشــەی ئادەمیزاد ئەگێڕنەوە لە گەڵ ژیانا •

لە رشتەی‌مرواریدا گەلێك لاپەڕەو باس هەیە ، کە ئەچنــە ریزی زانستی فۆلکلۆرەوە بە گشتی ، بــەڵام دوورن لە باسی ئەدەبی فۆلکلۆر • ئەو باسانە بۆ گەلێك لێکۆڵینەوەی زانستی‌ی تریش بەکار دێن • لە کۆڕی فۆلکلۆردا کۆمەڵێك عادەت‌و رەوشت‌و خــووی کۆنی ناو کوردەواری‌ی کۆکردۆتەوە کە لە مەوبەر ئیسماعیل حــەقی شاوەیس لە ژێر ناوی « پروپوچی‌پێشینان »دا هەندێ باسی لــەوەوە نزیکی لە سالی ١٩٣٣دا نووسیوەتەوەو[٣٠] چاپی کردووە ، ئــەم جۆرە باسەکەرە سەیەکی دەولەمەندە بۆ ئەو زانایانەی بــە ژیانی

کۆمەڵەوە خەریك ئەبن ۰

لە چەند لاپەڕەیەکی‌تردا هەندێ زانیـــاری‌ی بە نرخی دەربارەی ڕۆژو ساڵو مانگ کۆکردۆتەوە کە بۆ ئەوە دەست ئـــەدات بکرێت بە سەرەتای باسێکی درێژ دەربارەی زانستی « فەلەك » لـــــە لای کوردان ، بە تایبەتی گەر تۆزێ درێژ ترو وردتر لە ســـــەر حسابی گلەزەردەو زانای گەورەی « فەلەك »ی کوردان شێخ حەســـــەنی گلەزەردە بدوایە ۰

« رشتەی‌مرواری » لە گەلێك لاپەڕەی‌دا وەسفی چەند دەورێکی مێژوویی ژیانی کوردانو ناوچەی سلێمانی‌ی خستۆتە پێش چاو ، بـــە تایبەتی دەوری جەنگی یەکەمی جیهانو سالآنی گرانی‌و ڕۆژانی شـێخ مەحموودی‌نەمرو لافاوە دوا بە دواکانی سلێمانی ۰ ئەم وەسفانە لـــە پاڵ « فاکتە » مێژووی یەکەی خۆیدا یاریدەیەکی باشی مێژوو ناســـان ئەدات کە بە جۆرێکی ڕاستەقینە لە مێژووی نەتەوەکەمان بکۆڵنەوە ۰

زۆر باسی لەم بابەتەی رشتەی‌مرواری ئێستا لای خوێنەری کورد ئەو نرخەی نی‌یە ، چونکە ئەو شتانەی لەوێدا وەســــف کراوە وان لەبەرچاویا لە سنووری بیرەوەری‌ی خەڵك نەچوونەتە دەرەوە ۰ بەڵام ئەو باسانە بۆ سالآنی داهاتوو بایەخێکی زۆری هەیە ۰

لێرەدا جێگەی یادداشتێکی ئەدەبی‌ی بچووك تۆمارکردنە ۰ لـــە ساڵی ١٩٥٢ کە زانا عەلائەدین سوجادی کتێبی « گەشتێك لــــــە کوردستانا »ی چاپ‌کردوو باسەکانی بەلای زۆرکەسەوە سەیر بوو ، لە وەڵامدا ئەی‌ووت : من ئەمەم بۆ ئەمڕۆ نـــــەنووسیوە ؛ دواڕۆژ نرخی‌ئەزانن۰ئێستا کە زۆر بەسەر نووسینی ئەو کتێبەدا رانەبووردوە، ئەبینین زۆر لەباس‌و زانیاری‌یەکانی ، تەنانەت لـــە رووی روخساری « جوغرافی »ی وولاتیشەوە نرخێکی گەورەی هەیە ۰رشتەی مرواری لە پاڵ تۆمارکردنی حیکایەت‌و ئەفسانەو وەسفی مێژوویدا هـــەندێ شتی تیایە کە ئەچێتە خانەی « هەواڵی ئـــەدەبی‌یەوە » وە بۆ مێژوو

ئەمێنێتەوە • نموونەی ئەمانە ئەو دەنگ‌وباس‌و قسە خۆشانەیە کە لە نێوان گەلێك لە شاعیراندا رووی‌داوە • قسەی خۆشی « شێخ رەزای تاڵەبانی » لە مەیدانی ئەدەبدا ئەچێتە پاڵ شیعرەکانی‌و تابلۆیەکی ژیانی زانستی‌و ئەدەبی ووڵات لەو سەردەمانەی رابوردوا نەخشە ئەکێشێ • هەندێ پارچە شیعری تازەو هەندێ نامەی ئەدەبی‌ی تۆمار کردووەو لە فەوتاندن پاراستوونی • لەوانە نامەیەکە کە شاعیری بەناوبانگ « ناری » ـ مەلا کاکە حەمەی بێلو ـ بۆ شێخ مەحموودی نەمری نووسیوەو پارچەیەك لە نووسینی پەخشانی کوردی‌ی سەردەمی ناری‌و ئەدیبانی وەك « ناری »مان پیشان ئەدات[٣١] •

خاوەنی رشتەی مرواری گەلێك قسەی خۆشی دەربارەی « نەزانی »و لە « وێل » دووری تیرە کۆچەرەکان نووسیوەتەوە بـا هەر تەماشای ئەوە بکەین بزانین دەربارەی ئەو هەڵکەوتووەی رابەری جاف ئەڵێ چی ؟ کە لەم بارەیەوە نووسیویە :

« مەحموود پاشای جاف یەکێك بوو لە پیاوە هەرە گەورەکانی کورد ئەو پیاوە بوو کە لەگەڵ « وەسمان پاشای » برایا دەستە جڵەوی عەشرەتی جافیان گرتبوە دەست وە هەڵیان ئەسووڕاند ئەو عەشرەتە کە خاوەنی چل هەزار خێوەت‌و لە « شاکەل »و « شیروانە » وە دایانگرتبوو تا « شاقەڵا »و « مەولاناوا » ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی ترەوە ئەم مەحمود پاشایە ووڵاتانی دیبوو ، پیاوانی گەورەو کۆشکی والی‌و پادشاهانی دیبوو ، لە هەر لایەك گوڵێکی چنی‌بوو ، لە هەر شوێنێك ئەدەبێکی وەرگرتبوو لە ئەنجاما خۆی بوو بوو بە پیاوێکی ئەدەب ـ پەروەری کورد • بەو « زەکا »و ئەدەبەوە سەرۆکی ئەو عەشرەتەی ئەکرد کە هەر یەکە لە تەلێك‌لێ‌یان ئەداو هەر یەکە جۆرە ئەقڵێکیان هەیە •

بەڵێ لە رەمەکی جافا گەلێ پیاوی ژیرو دانا هەڵکەوتووە ، ئەبێ هەڵکەوێ چونکە نەسیمی دەربەندان‌و هەوای دەشتان کە تێکەڵ بە

جریوەی ئەستێرەی ئاسمان بوو ، دیمەنەکەیان ئەکاتە کارێ کە لالغاوەی فیکرو هۆش و پیاوی هەوار گەڕێ ئەو دیــــمەنە لێك بکشێنێتەوەو باوەڕی سافی وەکو دوڕدەربڕێ . وەکو ئەمە ئەبێ گـــــەلێ پیاوی ساویلکەش لەو کۆڕەدا ئەکەوێتە مەیدانەوە کە ئاسۆی فیکری تەنیـــا پڕی مێشکەکەیەتی و هیچی‌تر .

جا پیاوێك کە سەرۆکی عەشرەتێکی وا بگرێتەدەست ، ئـــــەبێ دانایی‌یەکەی و فراوانی دڵەکەی گەلێ گەورەتر بێت لە گەورەیی ئـــەو عەشرەتە ، ئەگەر وا نەبێ عەشرەت‌داری پێ‌ناکرێ .راستە پێ‌ی‌ناکرێ ، چونکە ئەزانێ ئەمانە بە دڵێکی سافەوە قسەکەشیان گـــــەنجینەیەکی گەوهەرە بۆ زمانەکەیان . بۆیە « مەحموود پاشا » هەموو جار لەگەڵ هەرکەس لە پیاوی عەشرەتەکەدا بە پێ‌ی ئەقڵی ئەو قســــەی لەگەڵ کردوەو لە پێکەنین بەولاوە هیچی‌تری نەداوە بە رووبا . هەر ئـــــەم دڵفراوانی و عەشرەت‌داری‌یەی ئەو بووە کە کردوویەتەکارێ ، نوکاتێ ئەدەبی بە نرخی کوردی بۆ زمــــانی کوردی ماوەتەوەو بوە بــــــە گوڵدەستەیەك بۆی »(٣٢) .

گەر پیرەمێرد بە هۆنراوە جوانەکانی ، لە دیمەنی ســــــەرچاوەی زەڵم و « دووئاوان »و « شوێن‌ماڵەگەورە »دا دیمــــەنێکی « پۆل‌پۆل نازداران »ی عەشیرەتی جـــــاف و گەرمیان و کوێستان کردنیـــــانی پیشاندابی و یادێکی ئەو مەحموود پاشایەی کردبێتەوە کە لە دیوەخانی ئەدەبیاتا دەنگی شیعری پیرەمێرد بەرزبۆتەوە ئەوا سوجادی بــــــە شێوەیەکی فراوانترو رووترو قووڵتر چۆتـــــــە ناو وردەشتی ژیانی عەشیرەتەکەی مەولانا خالیدو ئەحمـــــەد موختارو تایەربـــــــەگ‌و گۆرانەوە .

لە هەندێ قسەگێڕانەوەدا تەنانەت « مەنەلۆجێکی » ناو دەروونی کەسێکی سادەی جاف پیشان ئەدا بەرامبەر بە ژیان .

با بۆ نموونە چیرۆکێکی کورت دووبارە بکەینەوە کە چۆتە ناو ئەو

دەروونە سادەیەوەو لەوێدا وێنـــەی وولاتو نیشتمانو کـــەژی خۆشەویست بە قوولیو نزیك لە خاکی پیرۆزەوە پیشـــان ئەدات •
ئەگێڕنەوە ئەڵێن : کابرایەکی کورد رۆژێك لـەو شارەزوورە تای لێ هاتبوو رۆژەکەی زۆر گەرم بوو ، هەرچەند داوای ئاوی ئەکرد ئاوی سارد دەست نەئەکەوت ، ئاوی گەرمیان ئەدایەو هیچ هـــەوایەکی فێنکیشی نەئەدی • ئەوەندە هەبوو شاخی هەورامان لە دوورەوە دیار بوو ، بۆ ئەو شوێنە دوو رۆژە رێگە ئەبوو ، بەفرەکە بە ســـەر شاخەکەوە دیار بوو • کابرایەکی خزمی بۆ هەواڵ پرسین هات بۆ لای لەبەر دەمیا راوەستاو بەرشاخەکەی لێ گرت ، ئەویش پێی ووت :
« کوڕە لای بەفرەکەم لێمەوڕەوە ، با هەوایەکی فێنکم بۆ بێت • ئەوا پڕوکیام »[٣٣] •
رشتەی مرواری کەرەسەی گەلێك باسی کۆمەلایەتیی بۆ ئامادە کردووین • گەر لە ئەفسانەی کوردیدا دیمەنێکی ژیانی کـۆنو پێش مێژووی کورد ببینینو لە رووی بیروباوەڕو ئاینیشەوە هەندێ وێنەی باوەڕی پێش ئیسلام دیاربێت • ئەوا لە رشتەی مرواریدا وێنـــەی ژیانی کۆمەلایەتیی ئەم چەند سەدەی دوایی‌یەی کورد دیارەو لـــە رووی ئاینیشەوە هەندێ حیکایەتی ئەوتۆ ئەبینین ــ کە هەر چەندە لە قالبی گاڵتەو پێکەنینا ئەگێڕێتەوە ، بەلام لەو دیو پەردەی پێکەنینەوە دوو رێچکە ئەبینین کە ئـــەچنەوە ســـەر باسی « کوردو ئاینی ئیســـــلام » •
خاوەنی رشتەی مرواری لە زمان دوو کوردی ســـاویلکەوە دوو حیکایەت ئەگێڕێتەوە بەلگەی قسەیەکی رابووردومانن • کـــەوا بۆ کورد دیوێکی ئیسلامەتی باوەڕکردنی قووڵو ڕاستەقینەیە بە خوایەکی تاكو تەنیاو دیوەکەی تریش بە سادەیی لە پەیڕەوی ئاین گـــەیشتنو بەڕووکەشی وەرگرتنی هەندێ پەیڕەوە کە لەبەر غـــەرەبی نەزانینو نەخوێندەواری لە مێشكو دەروونیدا چەسپ نەبووە • با بۆ بەلگـەی

ئەم قسەیە لەسەر هەر رێچکەیە حیکایەتێکی کورت لە رشـتـەی مرواری‌یەوە وەرگرین • ئەگێڕنەوە ئەڵێن :

« لە کابرایەکی کوردیان پرسی ، بەچی‌دا ئەزانی خوا یەکێکـەو دوو نی‌یە ؟ ئەویش ووتی : « بە ئاشەکەی ماڵی لالەما » تا ئەو وەختەی کە هەر خۆی بوو دایەگەڕ بوو ئێستە کە لەگەڵ حەمەی شەفێ بوون بە شەریك رۆژێك ئەگەڕێ‌و چوار رۆژ ئەوەستێ • خواش ئەگـەر یەکێکی کەی لەگەڵ بوایە ئیشەکەی وەکو ئاشەکەی لالـەمی لێ ئەهات »[٣٤] •

جا ئەم باوەڕە قووڵە ، کە لە زیرەکی‌یەکی سروشتی‌و لێك‌دانەوەیەکی سادەوە هاتوە لە ژیان‌و سروشت‌و ئاسمان‌و زەمین ئەم باوەڕە بـە خوایەکی تاك‌وتەنیاو ئەم لێك‌دانەوەیە کە لە مـەتتیقێکی ساکارەوە هاتوە ، لە پاڵ دیمەنە ئاینی‌یەکەیدا جەوهەرێکی کۆمەلآیەتیشی هەیە • هەر بەرامبەر بـەم لێك‌دانەوەیە • لـە ڕووی ئاین‌و لـە ڕووی کۆمەلآیەتیشەوە حیکایەتێکی تر لە رشـتـەی‌مرواری‌یدا ئەخەینـە بەرچاو • ئەگێڕنەوە ئەڵێن : « رەسوو ئاغای مەنگوور هەبوو پیاوێکی ریش سپی‌و بەزم‌لی بوو • زۆری حەز لە قومار ئەکرد ، هـەندێ جاریش نوێژی ئەکردو قورئانی ئەخوێند جارێکیان لـە کوڕێکی دیوەخانەکەیا دائەنیشێ‌و ملی خەڵکەکە ئەگرێ بۆ ئـەوە قوماری لەگەڵ بکەن • کەس ملی ناداتی‌و لەگـەڵی ناکا • کاتی قـورئانی خوێندنەکەشی نزیك‌بۆتەوە • بە ناچاری خەڵکەکە ئەترسێنێ‌و ئەڵێ : « ئەگەر قومارانم دەگەڵ ناکەن دەچم قورئانان دەخێنـم »[٣٥] • وەکو ووتمان رشتەی مرواری هەندێ‌جار لە شێوەی وەسفاو هەندێ جار لە شێوەی « فاکت‌وژمارە »ی مێژوویی تۆمارکردندا پـەردەی گەلێك دەوری ژیانی ئەم چـەند سەدەی دوایی‌یەی کـوردانی پیشان‌داوە • بەلآم ئەم جۆرە پەردەیە تەنانەت زۆرجار لـە شێوەی حیکایەت‌و گاڵتەو پێکەنینیشدا پیشان دراوە •

دەربارەی رژێم‌و دەستگا عوسمانی‌یەکان زۆرشت ئەووترێ‌و زۆرشت ئەنووسرێ • رەنگە مێژوو لە چەند بەرگی گەورەدا بە هەزاران ژمارەش باسی ئەو دەورە بگێڕێتەوە •

پێوەندی کورد لەگەڵ ئەو دام‌ودەستگایەداو چۆنیەتی روانینە دەستگاو دامەزراوو یاسای باسی تایبەتی‌ی مێژوون • بەلاّم لەمانە هەموو قسەوڕاستی دەربڕتر ڕەنگە ئەم قسە خۆشە بێت کە لە بەرگی یەکەمی رشتەی‌مرواریدا نووسراوەتەوەو ئەڵێ :

« کابرایەك هەبوو براخاسی ناوبوو قسەمان لە هاڵوهەواڵی عەسکەری‌یەوە ئەکرد کە گۆیا ئێستە رێك‌وپێك‌ترە » •

ووتی : « برا رێك‌وپێکی‌چی ؟ من خۆم لە دەوری عوسمانیا زەفتی بووم ، دوکانەکەشم قەسابی‌بوو ، هەموو رۆژێ کە وەختی مەشق ئەهات دوو تارانیم ئەدا بەیەکێ ئەچوو مەشقەکەی بۆ ئەکردم ، بەو قورئانەی لێت‌خوێندووە ئێستەو ئەوساش خۆم ئەو قەنارەمە بەجێ نەهێشت • ئەوە بوو عەسکەری ئێستەش ئەمانە بەناخێری گیانیان گوایە عەسکەری ئەکەن »[٣٦] •

لە پەندی‌پێشنانی زۆر نەتەوەدا ، پەندێکی لەیەك‌چوو هەیە دەربارەی ئیش‌کردن‌و ئیش بە « بەرزگرتن »و بە سووکی تەماشای پیاوی تەمەڵ‌و تەوەزەل‌کردن لە کوردیدا ئەو پەندەمان گێرایەوە کە ئەڵێ : دەستی ماندوو لە سەر زگی تێرە • مەغزای ئەم پەندە بە تەواوی وەك پەیڕەوی ئایەتێکی قورئانی پیرۆزە کە ئەفەرموێ : « وأن لیس للانسان الا ما سعی »[٣٧] ـ واتە ـ ئادەمیزاد بە هەوڵ‌و تەقەلاو کۆشش نەبێت ، بەرهەمی ژینی چنگ‌ناکەوێت •

جا جەوهەری ئەم باسە کە لە زۆر زمانداو لە زۆر پەیڕەوی ئاسمانیدا هەیە لە جیهانی ئەمرۆدا بۆتە نەریت‌و پەیڕەوێکی «ئابووری» کە هەر کەسە هێندەی کۆششی خۆی بەرهەمی دەست‌کەوێت‌و لە بەری دنیا بخوات‌و ئەوی ئیش‌نەکات لە بەری ژیان بێ‌بەری‌بێت • واتە

دەستی ماندوو هەمیشە لە سەر زگی تێر یێت •
جا جەوهەری ئەم باسە لە گەلێك حیكایەتو چیرۆكو ئەفسانەی كوردیتدا هەیە • وە لە « رشتەی‌مرواری »دا كە ئاوێنەی گەلێك لە بەشەكانی فۆلكلۆری كوردی‌یە، لە شێوەی حیكایەتی« گاڵتەوگەپ»دا ئەم بیرە پیشاندراوە •
چەرمەسەری‌و سەركردن بە كۆشی هەموو جۆرە هەوڵو كۆششێكداو پشت بە خۆ بەستن لە « نان‌پەیداكردندا » گەلێك حیكایەتی لەسەرە • لەوانە ئەمەیە كە لە رشتەی‌مرواری‌دا ئەگێڕێتەوە ئەڵێ : « كابرایەكی پاوەیی لە دێ‌یەكی خۆیان دێتە دەرەوە بە نیازی سوالكردن ، ئەگاتە قەراخ ئاوایی چاو ئەنووقێنی‌و دەست ئەكوتێ بەردێكی گەورە هەڵئەگرێ ئینجا ڕوو ئەكاتە ئاسمان وئەڵێ : «خوایە تۆ ریشێكی پان‌و زمانێكی لووسم بدرەیێ ئیتر رسقی خۆم لەسەر خۆم ، شەرتبێ بە گرانایەتی ئەم بەردە پارە نەیەنمەوە نەیەمەوە »[٣٨] •
لە گێڕانەوەیەكی‌تردا ئەم حیكایەتە ئەدرێتە پاڵ كوردێكی شارەزووری‌و ئەووترێ : « ریشێكی چەرمگ‌و زمانێكی وە چەرخم بدەرێ »
لە « رشتەی‌مرواری »دا گەلێك حیكایەتی تر دەربارەی ئیش‌كردن هەیە ، لە هەندێ شوێندا نەخشەی كاریكەتۆری كێشانی پر لە پێكەنینی پیاوی « بی‌كارو » ئیش‌نەكەرو تەمەڵە • لەوانە ئەم حیكایەتەیە كەئەڵێ : « ئاوایی‌یەك لەوبەر كێوە گاوانیان نەبوو ، پیاوێكی تەمەڵی تەوەزەل لەوێدا بوو بانگیان‌كرد ووتیان : گاوانی‌یەكەمان ئەكەی یا نە؟ ووتی :
ئەگەر كەرێكم بۆ كورتان بكەن سواری بم ، هەمانیەكم مێوژ بدەنێ لەبەردەمما دابنێم بیخۆم ، منداڵێكیشم لەگەڵ بنێرن ئەگەر گاگەلەكە بڵاوەی‌كرد بۆم كۆبكاتەوە بۆچی نایكەم »[٣٩] •
بەم جۆرە حیكایەتی گاڵتەوگەپی كوردی ، لە زمان گەلی كوردەوە

که نەتەوەیەکی ئیش‌کەرو زەحمەت‌کێشە ، گاڵتە بە هەموو ئەو کەسانە ئەکات کە نایانەوێ بە ئارەقی ناوچەوان نان پەیدابکەن‌و ئەیانەوێ لە سای سێبەردا دابنیشن‌و رەنجی خەڵکی‌تر بخۆن •

بە کورتی سێ‌بەرگەکەی «رشتەی‌مرواری» شتێکی تازەو پاراون لە مەیدانی نووسینەوەی فۆلکلۆرو ئەدەب‌و بزووتنەوەی بیرووناکی‌ی کوردیدا ؛ لە مەیدانی سامانی نەتەوایەتی‌ی کورددا جێگـــەیەکی تایبەتی‌یان بۆ خـــۆیان گرتووە • وە لە کۆڕی زمـــانی کوردیدا دەوڵەمەندکردن‌و فراوان‌کردن‌و هەوڵێکی جوامێرانەی پاراستنی زمانی کوردی‌یە ، وە لە کۆڕی دیالێکتـــەکانی کوردیدا دەچــەسپاندنی هەندێ ــ دوانە ــ لە چیرۆکدا یا دیالێکتی جیاجیای زمانی کوردی ، وە لە هەندێ جێگەدا لەم مەیدانەشدا بۆ بەراوردکردن دەست‌ئەدات •

بە کورتی گەر بگونجێ لە مـــەیدانی بیرووناکیدا ووشـــەی « تاسوق » بەکاربهێنین ، ئەوا «رشتەی‌مرواری» بەرهەمێکی ئەدەبی‌ی « تاسوقە » هیواداریـن بەرگەکانی تری زوو رۆشنایی ببینن‌و لە کۆڕی نووسینەوەی فۆلکلۆری کوردیدا لەم جۆرە بەرهـــەمانە زۆرببن‌و سوودی‌خۆیان لە پلەی ئەمڕۆماندا بە بزووتنەوەی بیرووناکی کوردی بگەیێنن(٤٠) •

« رشتەی‌مرواری » زۆرتر ئەچێتە ریزی گێڕانەوەو نووسینەوەو سەرلەنوێ دارشتنەوەی فۆلکلۆرەوە • بەڵام ئێستا لە کۆڕی ئەدەبی نەتەوەییماندا شتێکی تازە رووئەدات ، ئەویش ئەوەیە کە لەم دوایی‌یەدا گۆڤارو رۆژنامەی کوردی جاروبار قســـەی خۆشی هەندێ لــــەو قارەمانانی گاڵتەوگەپانە بڵاوئەکەنەوە کە هێشتا لە ژیاندان • بێ‌گومان ئەم قسانەش بە ناوی ئەو کەسانە خۆیانەوە تۆمارئەکرێت‌و ئەچێتـــە پاڵ سەدان قسەی خۆش‌و گاڵتەوگەپی تری بێ‌قارەمانەوە کە لــــە چاپەمەنیدا بڵاو ئەکرێتەوەو وا ئەکات کە ئەو قسانەی ئەم قارەمانانەی ئەمرۆ لە دوا رۆژا نەچێتە سەر سامانی نەتەوەیی فۆلکلۆر ، بەڵکو هەر

له ئێستاوه له ریزی ئەدەبی نووسراودا تۆمار بکرێن‌و به یەکێك لــه جۆرەکانی نووسینی پەخشان دابنرێن • بەلآم مێژوو له باریا هــەیه بۆ دوارۆژ قسەی‌تر له کۆڕی گاڵتەوگەپدا دروست‌بکات‌و بیداتــه پاڵ ئەو قارەمانی گاڵتەوگەپانەی ئێستا له ناو ئێمەدا ئەژین‌و ئەو قسـانەی ئەوسا بچنه سەر سامانی نەتەوەیی فۆلکلۆرمان •

له باسی ئەدەبی نووسراوەی گاڵتەوگەپدا ئــەبێ ، باسی ئــەو قارەمانی گاڵتەوگەپەش بکرێت که ئێستا له ناوچــەی سلێمانی‌و زۆر ناوچەی کوردەواریدا ناوی دەرکردووەو به « خاڵه رەجــــەب »(٤١) ناسراوه • قسەکانی خاڵه رەجەب ناوەرۆکێکی کۆمەلآیەتی‌یان تیایــەو گاڵته به زۆر شێوەی ناقۆلآی ژیانی کۆمەڵ ئەکەن ، هەندێ جاریش به شێوەیەکی زۆر زیرەکانه له ژیان‌و کۆمـــــەڵەوه ، یا ئه یاری بــه ووشەکردنەوه ، کەرەسەی پێکەنین‌و گاڵته ئەخولقێنن زۆرتری ئــەم قسانه تاپۆی ئەم سەردەمەی ژیانی شارستانی‌و کۆمەلآیەتی‌ی شـاری سلیمانی‌یان پێوەیه(٤٢) •

## مــــەتــەڵ :

« مەتەڵ »یش بەشێکه له ئەدەبی فۆلکلۆری گەلان • واتــــه بەشێکه لەو ئەدەبەی نەنووسراوەتەوه دەماودەم لەناو خەڵکــــــدا پشتاوپشت ئەمێنێتەوەو بلآوئەبێتەوه • بۆیه پێویسته له کۆتایی باسی ئەدەبی فۆلکلۆردا به چەند دێرێك باسی « مەتەڵ »یش بکەین •

مەتەڵ ــ له ریزی فۆلکلۆرو بەرهەمی « زاری ــ یا ــ دەمی »ی خەڵکدا سنوور بۆ داناتێکی کورتی رووداوێك یا کەرەســــه یاخود « مادە »یەکه بەلآم به پێچەوانەی قسەی نەستەقەوه خەڵکی ئــــەم سنوور بۆ دانانه به ئەنقەست له شێوەیەکی نادیار یا « تــــەماویدا » دەرئەخەن‌و راستی ووتنی قسەکه ئەخەنه شێوەیەکەوه کــــه خەڵکی تر بیلێت یا هەڵیبێنن • وەك ئەڵێت : هەر ئەڕۆیت‌و نایگەیتێ ــ کــــه سێبەره • یاخود بابی پۆولێکه پڕ به ژوورێکه که مۆم یا چرایه •

له « مەتەڵ »دا هەر وەك قسەی نەستەق ، شەقڵی تایبەتی‌ی سەرپەرشتی‌ی میللەت بەسەر رووداوی جیاجیای ژیانەوە ئاشکرایە تواناو بەهرەداری گەل لەوەدا دیارە کە زۆر بە کورتی‌و پاراوی‌و لە پاڵەوە کەرەسەو سروشتی شیعر بدا بەم رووداوانە •

« مەتەڵ » لە ئەدەبی فۆلکلۆردا هەروەك گاڵتەوگەپ ، هەندێ جار بێ مەبەس‌و بۆ کات بردنەسەرو زاخاوی‌مێشك دانەوەیە ، وە هەندێ جار مەبەستی تایبەتی‌ی ژیانی هەیەو هەروەك گاڵتەوگەپ‌و بەشەکانی تری ئەدەبی فۆلکلۆر ئەبێتە هۆی هەوڵدانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی •

هەروەك لە مەیدانی ئەدەبدا زۆر جار هونەرمەند نیشانە بۆ مەبەستێکی سیاسی بەکارئەهێنی‌و زۆر جار ئەم نیشانە بەکارهێنانە یا لە بەر باری سیاسی‌یە یا لەبەر جوانی‌ی « نیشانە »کە خۆیەتی لە رووی هونەرەوە ، هەروەها مەتەڵیش بۆ ئەم مەبەسە بەکارئەهێنری • ئەو « مەتەڵ »ەی کە سەرەتاکەی لە ئەدەبی فۆلکلۆرەوە دەست پێ‌ئەکات • چ ئەوەی مەبەسێکی تیایەو چ ئەوەی تەنیا بۆ زاخاوی مێشکە لە ژیانی هەمە جۆرەی ئەمڕۆدا گەلێك جۆر شتی تازەی هێناوەتە کۆڕەوە ، کە هەندێکیان هەر لە مەیدانی ئەدەبدان‌و هەندێکیان لە سنووری بزوتنەوەی زانیاری‌و رۆشن بیریدان‌و هەندێکیش لەم سنوورە ئەچنە دەرەوە • بۆ نموونەی ئەمە لەسەر لاپەڕەی گۆڤارو رۆژنامەکانی جیهاندا جۆرەها شتی نووسراو ئەبینین کە بابەتی زاخاوی مێشکن‌و هەر یەکەشی ئەچنە خانەیەکەوە لە خانەکانی بەرهەمی مێشك‌و هونەری ئادەمیزاد •

لە ناو نەتەوەی کوردیشدا گەر بەرهەمێکی زۆری مەتەڵی فۆلکلۆرماز هەبێت‌و لە کۆڕی ئێشك‌گرتن‌و شەونخوونی‌و دانیشتنی گوێ ئاگردانی شەوانی سەرمای کوردەواریدا « مەتەڵ »یش چووبێتە ریزی بەشەکانی‌تری ئەدەبی فۆلکلۆری کوردەوە • ئەوا ئەتوانین ـ

یەکەم ــ ئەم مەتەڵی کوردی‌یانە وەك مەتەڵی خەڵکی‌تر بکەین بە دوو بەشەوە .

مەتەڵی « مەیەس‌دار »و مەتەڵێك کە تەنیا بۆ زاخاوی مێشکە . هەر دوو جۆرە مەتەڵەکەش ووردی‌و تێبینی‌و ژیری‌و بــە وریایی‌و قووڵی تەماشاکردنی نەتەوەی ئێمە دەرئەخا . تەماشاکردنی هـــەمو و شتێکی دەوروپشت‌و هەموو رووداو کەرەسەیەکی ژیان . گەر لــە مەتەڵی کوردی بکەڕێین‌و کۆی‌بکەینەوە ئەوا گەلێك نموونەی ئــەم مەبەسەو باسی‌تریشمان دەست ئەکەوێت .

دووەم ــ مەتەڵی کوردی وەك مەتەڵی گــەلێك زمانی‌ترو وەك ئەدەبی فۆلکلۆر تێکڕا ، دەستێکی باڵای هەیە لە پاراستنی هـــەندێ « اصطلاحات »و « ووشەی تایبـــــەتی »ی زمانی کوردیدا ، بەڵکو زۆرجار لە داڕشتنی مەتەڵەکەدا لـــە پاڵ بیری ورددا جـــوانی‌یەکی پەیکەرو ووشە هۆنینەوەش ئەبینین .

با لەم باری سەرنجەوە تەماشایەکی ئەم مەتەڵە بکەین کـــە بۆ « هێلکە » دانراوەو ئەڵێ : سایەقەی ساماڵ ، هەوری قــەرەنگی دوو ئاو لە جامێ هەر یەك لە رەنگێ .

زۆر جوان « قەڵەمی » هۆنەرمەندێك یا هۆنینەوەی هونەرمەندێك لە پشت جوانی‌ی زمان‌و « ووشەی » ئەم جۆرە مەتەڵەوە دیارە ، ئەو هونەرمەندەش هەر خاوەنەکەی هەموو فۆلکلۆری کوردی‌یە . واتە ، نەتەوەی کوردی سەرفراز خۆیەتی .

مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی لە پاڵ ئــەم سروشتانەیدا ، بۆتــە سەرەتایەك بۆ « مەتەڵ »یش لە ئــــەدەبی نووسراوەی کوردیدا . هەرچەندە زۆری مەتەڵە ئەدەبی‌یە نووسراوەکان، هەر لەو کاتەوە کــە رێگەیان بەرەو لاپەرەی گۆڤارو رۆژنامەکان گرتۆتەبەر لـــە قاڵبی فۆلکلۆر دەرچوون‌و هەندێکیان چوونەتە ریزی ئــەدەبی نووسراوەوە هەندێکیش هەر لە سنووری ئەدەبیاتدا ژمارەناکرێ . بــەڵکو جۆرە

ووشه ریزکردنێکی هونەرمەندانەیە بە مەبەسی زاخاوی مێشك و کات بردنە سەر .

ئەو بەشەی یەکەمیش بۆیە بە ئەدەبیاتی نووسراو ئەزانرێ ، چونکە لە ناو خەڵکدا پەیدا نەبووە ، بەڵکو نووسەرو شاعیرانی ئێستامان ئەیانووسن تەنانەت لە مێژووی ئەدەبیاتی هاودەمماندا ئەتوانین ئەوە تۆمار کەین کە چەند شاعیری ناسراومان ، بە شێوەیەکی هونەرمەندانە لە مەتەڵ داناندا بەشدار بوون . بەتایبەتی ئەو شاعیرانەی بە پەروەردەکردنی نەوەی تازەوە خەریك بوون .

---

(١) علاء الدين سجادي . ڕشتەی مرواری بغدا ، ١٩٥٨ ب٢ ، ل ١٨٥

(٢) مەلای بەناوبانگ ( مەلای مەشهوور ) . بۆ پێکەنین . ب ٢ چاپخانەی هەولێر ، ١٩٦٧ ، ل ٩٢ .

(٣) لەتیفەهای تاجیکی ، ستالین‌ئاباد ، ١٩٥٨ ، ل ٣

(٤) گەردلێفسکی . قسەی خۆشی خواجە نەسرەدین . موسکو ، ١٩٥٧ . ل ٢٤٧

(٥) قسەی خۆشی مەلا نەسرەدین . بلاوکردنەوەی ئەکادیمیای زانستیی ئازربایجان . باکو ، ١٩٥٩ ، ل ١٥ .

(٦) گۆڤاری ( الجديد ) حیفا ، ١٩٥٤ . گۆڤاری ( الفنون الشعبية ) . القاهرة . يوليو ١٩٦٧ .

(٧) حیکایەتی مەلای مەزبوورە . کۆکردنەوەی محمد مصطفى کوردی بغدا ١٩٣٩ .

(٨) حیکایەتی ملای مشهوور . کرکوك ١٩٥٣

(٩) بڕوانە ( ٢ ) . ( ١٠ ) ئەوسەرچاوەیە . ل ٢

(١١) ئەوسەرچاوەیە ، ل ٣ .

(١٢) ڕشتەی‌مرواری ، ب ١ . ل ٨

(١٣) دەستنووس (١٤) بڕوانە سەرچاوەی ٢ ، ل ٨

(١٥) ئەوسەرچاوەیە ، ل ٢١ـ٢٢

(١٦) المنجد في اللغة والادب والعلوم . بيروت ، ١٩٦٠ ، ص ١٨

(١٧) دەستنووس . (١٨) سەرچاوە ٢ ، ل ٩٠ ـ ٩١

(٢١) ئەوسەرچاوەیە ، ل ٧٩ .

(٢٢)،(٢٣) ئەو سەرچاوەیە ، ل ٢١

(٢٤) سعدی شیرازی . کلیات

(٢٥) بهلول عاقل . تهران ، ؟ ص ٢ ( بەفارسی )

(٢٦) بڕوانە سەرچاوە ٥ (٢٧) قسەیەکی باوی ناو مەلایانە

(٢٨) لە گالتەوگەپی پیرەمێرد ( سلیمانی ، ٩٤٧ )و رشتەی مرواریشدا ئەم خستەوە نووسراوەتەوە . بەلام هەردووکیان لە سەرەتاو کۆتاییو دارشتندا لەوە اچن ، کە بە منداڵی بیستوومە .

(٢٩) ا ئێستا نووسەر جەمال بابان شتێکی لەسەر ئەحەی کوڕنوو نووسیوە . بێجگە لەوەش کە لە رەشتەی مرواریدایە .

(٣٠) اسماعیل حقی شاوەیس . ڕوبوچی پێشینان ، بەغدا ، ١٩٣٨

(٣١) رشتەی مرواری . ب ١ ، ل ٨٩ ، ٩٠

(٣٢) ئەو سەرچاوەیە . ب ٢ ، ل ١٢٠ ، ١٢١

(٣٣) ئەو سەرچاوەیە . ب ١ ، ل ١٠٧

(٣٤) ئەو سەرچاوەیە . ب ١ ، ل ١١ ، ١٢

(٣٥) ئەو سەرچاوەیە . ب ١ . ل ٩٤ ، ٩٥

(٣٦) ئەو سەرچاوەیە .

(٣٧) قورئانی پیرۆز ، سورەتی نجم ، ئایەتی ٤٠

(٣٨) رشتەی مرواری .

(٣٩) رشتەی مرواری .

(٤٠) بەش نووسینی ئەم کتێبە بەرگی چوارەمی رشتەی مرواری دەرچوو « بەغدا ١٩٦٨» کە لە ناوەرۆکدا جیاوازیی لەگەل سێ بەرگەکەی تردا نییە .

(٤١) رەجەبی حاجی محەممەد ، خەڵکی گەرەکی سەرکارێزی شاری سلێمانییە.

(٤٢) ئەم دواییەدا خالە رەجەب خۆی، کۆمەلێک لە قسەکانی خۆیی لە ژێر ناوی « ترشی سیربن »دا بلاوکردەوە « سلیمانی ١٩٦٩ » .

تێبینی : مەبەس لە ( دەستنووس ١ ) لەم کتێبەدا ، ئەو دەستنووسی بەندی پێشینانەیە کە نووسەر محەممەدی مەلا کەریم کۆیکردۆتەوەو مەبەسیش بە ( دەستنووس ) ، کۆمەلە بەرهەمێکی فۆلکلۆری هەمەرەنگەی لای دانەرە .

## کتێبه چاپکراوەکانی دانەر :

١ ــ فەرهەنگۆك بۆ قوتابیانی کورد ( عەرەبی ــ کوردی ) بەغدا ١٩٥٥ ٠

٢ ــ میرزا فەتح عەلی ئاخوندۆڤ ٠ ( وەرگێرانە لە رووسیەوە بۆ عەرەبی ) لە نووسینی پروفیسۆر جافەر جافەرۆڤ ٠

٣ ــ الواقعية في الادب الكردي ٠ بيروت ١٩٦٦ ٠ ( بە عەرەبی ) ٠

٤ ــ ڕازی دووری ٠ ( کومەلێك هۆنراوەو ووتارو چیرۆکـە ) ٠ بەغدا ١٩٦٨ ٠

٥ ــ (گولستان)ی سەعدیی شیرازی وەرگێرانی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا ( سەفوەت )ی حاجی مەلا ڕەسوول لە فارسیەوە بۆ کوردی ٠ بەراوردکردنی لەگەڵ وەرگێرانیتردا ( بۆ عەرەبیو ڕووسی )و فەرهەنگ دانانو پێناسینی ئەو ناوانەی لە کتێبەکەدایەو بلاوکردنەوەی لەلایەن دانەرەوە ٠ بەغدا ، ١٩٦٩ ٠

٦ ــ ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی ( لێکۆلینەوە ) بەغدا ، ١٩٧٠ ٠

---

٢٠٠٠ / مارت ١٩٧٠

